

پرۆژەی پیت بۆ خزمەتی فەرموودە
وەرگێڕانی: سیروان کاکە أحمد
منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com
چل فەرموودە
دەربارەی بە گەورەگرتنی قورئانی بەڕێز
مانای زمانەوانی، پەیامە پەروەردەییەکان، ڕێنمایيە کردارییەکان
ئامادەکردن و کۆکردنەوەی
لیژنەی زانستی پرۆژەی بە گەورەگرتنی قورئان




کۆکردنەوەو ئامادەکردن: لیژنەی زانستی پڕۆژەی بەگەورەگرتنی قورئان
وەرگێڕانی : سیروان کاکە أحمد
دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی
دیزاینی بەرگ : حکیم أبو بکر
چاپ : دووەم ١٤٤٢ك- ٢٠٢١ز
پێوانەی کتێب: ١٧ * ٢٤ سم ، ١٠١ لاپەڕە
بابەت : ئایینی
تیراژ : ٤٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٣١٨ ) ی ساڵی ٢٠٢١ پێدراوە








مـانـای زمانەوانـی * پەیامە پەروەردەییەکان * ڕێنماییە کردارییەکان

کۆکردنەوەو ئامادەکردن

لیژنەی زانستی پرۆژەی بە گەورەگرتنی قورئان

وەرگێڕانی

سیروان کاکە أحمد


﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ
وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ٩ ﴾

الإسراء : ٩



الحَمْدُللهِ رَبِّ العَالَمِين، وَالصَّلَاةُ وَالسَّلامُ عَلَى أَشْرَفِ الأَنْبيَاءِ وَالمُرْسَلِين، وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ الطَّيِّبِينَ الطَّاهِرِينَ، وَعَلَى كُلِّ منِ اقْتَفَى أَثَرَهُ إلى يَوْمِ الدِّين، أَمَّا بَعْد:

بێگومان قورئانی مەزن فەرمایشت و پەیامی خوای گەورەیە بۆ تێکڕای مرۆڤایەتی، خوا کردوویەتی بە نوورو ڕێنمایی و بەزەیی و جیاکردنەوەی هەق لە ناهەقەو ڕووح و چارەسەرە، وەک خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ تِبْيَـٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿٨٩﴾﴾ النحل (وە ئێمە قورئانمان ناردوەتە خوارەوە بۆت کە ڕوون کەرەوەیە بۆ هەموو شتێک وەڕێنمونی و میهرەبانی و مژدەیە بۆ موسڵمانان).

قورئان بریتیە لەو هەقەی نە لە پێشیەوەو، لە دوایەوە هیچ ناهەقی و پووچیەکی تێدانیە، ڕووحی ئەمین کە جبریلە هێناویەتە خوار بۆ سەر دڵی باشترینی پێغەمبەران ﷺ، کە ئەویش بە مەزنی گرتوە بە هەموو شێوەکانی بە گەورەگرتن: لە ڕووی بڕواپێبوون و خۆشویستن و تێفکرین و جێبەجێکردنی هەموو پیتەکان و سنوورەکانی، ئەویش بە کارپێکردن و جێبەجێکردنی ئەوەی کە تێیدا هاتوە، جا پێغەمبەر ﷺ قورئانێک بوو لەسەر زەوی دەڕۆیشت.

لە سۆنگەی هەست کردن بەو گەورەیی و ڕێزو پێگەیە، (مَشْـرُوعُ تَعْظِيم القُرْآن الكَرِيم) هاوکات سەر بە (الْجَمْعِيَّة الْخَيْرِيَّة لتحْفيظ الْقُرْآن الْكَرَيم بجِدَّةَ)، (خَيرَكم)، هەڵسا بە کۆکردنەوەی چل فەرموودە لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ لە نێو کتێبەکانی فەرموودە، بۆ ئەوەی هاندانێک و پاڵنەرێک بێت بۆ ئۆممەت، بۆ بە گەورەگرتنی کتێبی پەروەردگاریان و، هەروەها ئاسان لەبەرکردن و دەرس و دەور لەسەر کردنەوەی.

جا (مَشْـرُوعُ تَعْظيم القُرْآن الكَريم) گەورەیان کردین بە دەرچوواندنی چاپی سێیەم بە پاڵفتەکراوی و لێکۆڵینەوە بۆ کراوی، لەگەڵ زیاد کردنی مانا زمانەوانییەکان و، سوودو پەیامە پەروەردەیی و ڕێنماییە ئاکاریەکان، لە بەرگێکی نوێدا، کە -إِنْ شَاءَ اللَّهُ- یارمەتی خوێنەر دەدات لەسەر سوود بینین و، چێژ لێوەرگرتن لە خوێندنەوەی.

داواکارین لە خوای گەورە پاداشتی ئەو کەسانە بنووسێ کە بەم کارە هەڵساون، وە ئێمەش بگێڕێ لە ئەهلی قورئان، ئەوانەی کە کەسی تایبەتی خوان، وە بمانگێڕی لەوانەی دەیخوێننەوە بە خوێندنەوەیەک کە شایستەی بێت، وە هەڵدەستن بە هەق پێدانی سنوورەکانی و پیتەکانی لەسەر ئەو شێوازەی پێی لێیان ڕازی دەبێ.

**وَصَلَّى اللَّهُ عَلَى سَيِّدِنَا وَنَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِين.**

خزمەتکاری قورئان
سەرۆکی دەستەی کارگێڕی پڕۆژەی: (تَعْظِيمِ القُرْآنِ الكَرِيمِ)

**عبدالعزيز عبدالله حنفي**



# پێشەکی ..

الحَمْدُللهِ الَّذِي أَنْزَلَ الفُرْقَانَ عَلَى عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيراً، يَهْدِي بِهِ اللَّهُ مَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَهُ سُبُلَ السَّلَامِ وَيُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ، وَأَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، الَّذِي كَانَ لِلْقُرْآنِ مُعَظِّماً وَسِرَاجاً مُنِيرا، وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ الطَّيِّبِينَ الطَّاهِرِين، وَمَنْ تَبِعَهُمْ بِإِحْسَانٍ إِلى يَوْمِ الدِّين وَسَلَّمَ تَسْلِيماً كَثِيراً، أَمَّا بَعْد:

بە دڵنیایی قورئانی بەڕێز، پەرتووکی ڕێنمایی و ڕووناکیە بۆ (دۆزینەوەی ڕێگای ڕاست)، وە شیفاو چارەسەرە بۆ ئەو ناتەواویەی لە سینەکاندا هەیە، فەرمایشتی لێک جیاکردنەوەی هەق لە ناهەقە، بیرخەرەوەیەکی پڕ حیکمەتە بۆ هەموو خەڵکی، جبریل (عَلَيْه السَّلاَم) دایبەزاندوە بۆ سەر باشترینی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، پێغەمبەر ﷺ بەکردارو گوفتارەکانی چرایەکی ڕۆشنکەرەوە بوو، هەروەها بە گوفتارو جێبەجێکردنە کردارییەکانی بۆ ئەحکام و بڕیارەکانی قورئان و بەها بەرزەکانی، بە گەورەگری قورئان بوو لە ڕووی ڕواڵەت و نێوەڕۆکیەوە.

سوننەتی پێغەمبەریش ﷺ بنچینەیەکە لە بنچینەکانی شەریعەت، ڕوونکەرەوەیە بۆ قورئان، بێگومان سروشە لەپەروەردگاری جیهانییانەوە لەسەر زمانی پێغەمبەرە ئەمینداراەکەی ﷺ، وەک خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ ﴾ النجم (وە لە هەوا وهەوسەوە قسە ناکات (کە قورئان دەخوێنێت) ﴿٣﴾ هەرچی دەیڵێت (قورئانەو) نیگا دەکرێت بۆی). هەروەها خۆی ﷺ فەرموویەتی: {أَلَا إِنِّي أُوتِيتُ الْكِتَابَ، وَمِثْلَهُ مَعَهُ}[1]، واتە: ئاگاداربن! من قورئان و وێنەی قورئانم پێدراوە، کە بریتیە لەوەی وشەی «الحكْمَة» لە فەرمایشتی خوای پەروەردگار ئاماژەی پێکراوە: ﴿ وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمَا أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنَ الْكِتَابِ وَالْحِكْمَةِ يَعِظُكُم بِهِ ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٧٢١٣، تعليق شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صَحِيحٌ.



﴿ ... اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٣١﴾ ﴾ البقرة (بیربکەنەوە لە چاکەی خوا لەگەڵتاندا و ئەوەی کەبەسەریدا ڕشتوون لە قورئان و فەرموودەی بەجێ بەوە ئامۆژگاریتان دەکات وە لە خوا بترسن وەبزانن کە خوا بەهەموو شت زانایە)، بۆیە گرنگیدان بە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ وە پەیوەست کردنی بە قورئانی مەزنو ڕوونکردنەوەی، بێگومان بە گەورەگرتنی قورئان لە کارە پێویستیەکانە، جا پەرتووکی: (**الأَرْبَعُونَ حَدِيْثاً فِي تَعْظِيم القُرْآنِ الكَرِيم**) وەرگیراوێکە لە نێوەڕۆکی سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ جەختکردنەوە لەو مانایەو بەهێزکردنی لە دڵی ئوممەت.

ئا ئەم پەرتووکە کە چاپی سێیەمیەتی بە بەرگێکی نوێ، پێداچوونەوەو پاڵفتەکردنی تەواو بووە، لەگەڵ زیادکردنی مانای وشە نامۆکان، بۆ ئەم کارەش پشت بەستراوە بە کتێبی: (**النِّهَايَة فِي غَرِيب الحَدِيث وَالأَثَر**) هی (**إِبْنُ الأثير**) وە کتێبی: (**مَقَايِيسُ اللُّغَة**) هی (**إِبْنُ فَارِس**) وە کتێبی: (**فَيْضُ القَدِير**) هی (**الـمَنَّاوِي**)، بە هەمان شێوە شتە جوانە پەروەردەییەکان و، ڕێنماییە ڕەوشتیە کرداریەکان زیاد کراوە، کە فەرموودە بەرزەکان بە «ماناو مەبەستی بە گەورەگرتنی قورئانی بەڕێز»ەوە، پەیوەست دەکات و دەبەستێتەوە لە ژیانی ڕۆژانە، تاوەکو سوودەکە گشتگیر بێت و ئامانجەکە بپێکێت.

داواکارین لە خوای ﷻ قورئان بکاتە بەهاری دڵەکانمان و، ڕووناکی سینەکانمان، وە جوان خوێندنەوەو بیر لێکردنەوەو بە گەورەگرتنێکمان بۆ قورئان پێ ببەخشێ، بەو شێوەیە بێت کە خۆی لێمان ڕازیە.

وَصَلَّى اللَّهُ عَلَى سَيِّدِنَا وَنَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِين.



## پێشەکی وەرگێڕ

بِسْمِ اللَّهِ، الْحَمْدُ لِلَّهِ، وَالصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ

اللَّهُمَّ أعنِي يَا كَرِيم

هیچ نووسراوێکم نەبینیوە، هێندە تایبەت نووسرابێ، وە هێندە پێویست بێت بۆ کەسانێک کە پەکیان لەسەری کەوتبێ، وەک ئەوەی لەم کتێبەدا خوێندمەوە.

ئەم چەند پەڕە کە هەمووی زێڕو گەوهەرە، بە هۆی ئەوەی کەسانی تایبەتمەندو پسپۆڕ هەڵساون بە دانانی و، ئامانجێکی دیاری کراویان هەبووە، هەڵبەت بۆ کۆمەڵە کەسێکی تایبەتیش نووسیوویانە، دەتوانم بڵێم: تا ڕێژەیەکی زۆر سەرکەوتوو بوون لە کارەکەیان.

ئەم نووسراوە تایبەتە بە بنکەکانی پێ لەبەر کردنی قورئان (مراكز تحفيظ القرآن)، پێش فێرخوازەکان، بۆ مامۆستاکان نووسراوە، بڕوا ناکەم وشەیەکی بێ سوود هەبێت لەم نووسراوەدا. گەورەیی و ناوازەیی ئەم نووسراوە: بریتیە لە وەسف و ستایشی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ بۆ قورئان کە فەرمایشتی پەروەردگارەو، هاوکات خۆی ﷺ شارەزاترین کەسە بە فەرمایشتی خوا ﷻ، هەروەها باسی پلەو پێگەو پاداشتی ئەوانە دەکات کە سەرقاڵن بەم فەرمایشتە بە پێزە!

جا ئایا دەبێ چ پێزو هێزو چێژێک کۆبووبێتەوە لە کتێبێک کە بریتی بێ لە فەرمایشتی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ؟!

بەندە لەسەر داوای برای بەڕێزو خۆشەویستم شێخ موبارەک موحەممەد، هەڵسام بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە، دوای ئەوەی مۆڵەتی وەرگێڕانی بۆ زمانی شیرینی کوردی بۆ وەرگرتبووم.

تکاو ئومێدم وایە: دوای گەیشتنە دەست هەر بنکەیەک بتوانن، بیخەنە نێو بەرنامەی کاریان و، فێرخوازانیان لێی بەهرەمەند بکەن، وە سوور بن لەسەر بە دەستهێنانی ئەو هەموو سوودە بێ ئەندازەی کە تێیدا هاتوە...

سیروان کاکە أحمد

٢٠٢١-٣-٢٠

## ١ هەڵگرانی قورئان کەسانی تایبەتی خوان



١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لِلَّهِ أَهْلِينَ مِنَ النَّاسِ». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَنْ هُمْ ؟ قَالَ: «هُمْ أَهْلُ الْقُرْآنِ: أَهْلُ اللَّهِ وَخَاصَّتُهُ»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بێگومان خوا کەسانێکی تایبەتی هەن لە نێو خەڵک»، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانە کێن؟ فەرمووی: «ئەوانەی قورئانیان لەبەرەو کاری پێدەکەن، ئەوانە کەسانی تایبەتی خوان».

### ❁ مانای زمانەوانی ❁

(أَهْلِينَ): کۆی (أَهْل)ـە، ئەهلی مرۆڤ نزیکەکانیەتی لە هاوسەرو منداڵەکانی و جگە لەوان، وە بە (کۆ) هێنانی (ئەم وشەیە) لێرەدا ئاماژەیە بۆ زۆریان.

(أَهْلُ الْقُرْآنِ): واتە: دەرخکاران و کارپێکەرانی قورئان.

(أَهْلُ اللَّهِ وَخَاصَّتُهُ): واتە: دۆستانی خوان، وە لە کەسە تایبەتمەندەکانین، وەک چۆن مرۆڤ کەسانێکی تایبەتمەندی هەن (لە ژیانیدا).

---

(١) أَخْرَجَهُ أحمد: ١٢٣٠١، وَإِبْنُ مَاجَهْ: ٢١٥، انظر: صَحِيح الْجَامِع: ٢١٦٥، صَحِيح التَّرْغِيبِ وَالتَّرْهِيب: ١٤٣٢.



## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

• بە ئەندازەی نزیکیت لە کتێبی خوا، پلەی چاکەکاریی و نزیکی لە خوا بە دەست دێنی.

• ئەم قورئانە نێردراوەتە خوار بۆ هەموو خەڵکە بە گشتی، تایبەت نەکراوە بە ڕەگەزێک، یان ڕەنگێکەوە.

• گەورەیی و مەزنی قورئان دەردەکەوێ و دەدرەوشێتەوە بە ڕەنگدانەوەی نێوەڕۆکەکەی لە ئەهلی قورئان و کارپێکەرانی[1].

• باسکردنی فەزڵ و خێری شتەکان بۆ ئارەزوومەند بوون و تامەزرۆ بوون، شێوازێکی پێغەمبەرانەی پەروەردەییە، ورەبەرزی پەرەپێدەدات و نەفسەکان دەجوڵێنێ.

## ❁ ڕێنماییە کردارییەکان ❁

• لە هەر ڕۆژێکدا کاتێکی تایبەت دابنێ بۆ خۆت کە لەگەڵ قورئاندا بیت، بۆ لەبەر کردنی، یان خوێندنەوەی، یان تێڕامان و بیر لێکردنەوەی، بۆ ئەوەی ببیت بە کەسانی تایبەتی خوای بەرز.

• سووربە لەسەر ئەوەی هاوەڵایەتی و دانیشتنەکانت لەگەڵ ئەوانە بێت، کە کەسانی تایبەتی خوان، بۆ گەیشتن بە چاکەکاری و پلەو پێگەیەکی بەرزو مەزن.

---

(١) یانی: گەورەیی قورئـــان زۆر جار لە هەڵگرانی قورئـــان و کارپێکەرانیەوە دەردەکەوێ، لە ڕەوشت و ڕەفتار و کردارو گوفتاریاندا.





٢- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ ﵁، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «اقْرَءُوا الْقُرْآنَ، فَإِنَّهُ يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ شَفِيعًا لِأَصْحَابِهِ»[1].

واتە: ئەبو ئومامەی باهیلی ﵁، دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «قورئان بخوێننەوە، بێگومان لە ڕۆژی قیامەت دێت تکاو شەفاعەت بۆ خاوەن و هاوەڵەکانی دەکات».

## ❁ مانای زمانەوانی ❁

(**اقْرَءُوا**): لە (قَرَءَ)ـەوەیە، لە بنچینەدا ئەم بێژەیە بە مانای (کۆبوونەوەو کۆکردنەوەی شتێك) دێ، جا هەموو ئەو شتانەی کۆت کردوونەتەوە، ئەوە خوێندوتنەوە.

(**شَفِيْعَاً**): دەگوترێ: فڵان تکای بۆ فڵان کرد، کاتێک کە ئەو کەسە دێت، بە دوای جێبەجێ کردنی داواکاری کەســـەکەوەیەو یارمەتیدەریەتی.

---

(١) أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٨٠٤.

(لأَصْحَابِهِ): ئاماژەیە بۆ لەگەڵ بوون و نزیکبوونی کەسی تکاکار لەو هاوەڵەی، وە هەر شتێک کۆبوویەوە لەگەڵ شتێکی تر، ئەوە هاوەڵایەتی دەکات و لەگەڵیەتی.

## ❋ پەیامە پەروەردەییەکان ❋

• قورئـــان هاوەڵێکی وەفادارە، جا لە دونیادا بە چاکی هاوەڵیەتی بکە، ئەویش لە دوارۆژدا چاکەت لەگەڵ دەکات، بەوەی تکاکارەو شەفاعەتت بۆ دەکات.

• هـــاوەڵی ڕاستەقینە بەبانگەشە نیە، بەڵکو کردەوەو گرینگی پێــدانە، وە هاوەڵیەتیش لەگەڵ قورئاندا خوێندنەوەو کارپێکردنیەتی.

## ❋ ڕێنماییە کردارییەکان ❋

• لە هەر ڕۆژێکدا بەرنامەیەک دابنێ بۆ خوێندنەوەی قورئان.

• با لە هەر ڕۆژێکدا بە یەککەیشتنت هەبێ لەگەڵ قورئاندا بە خوێندنەوەو سەیرکردن و، تێڕامان و، کار پێکردنی.

• دانیشتنت لە خزمەت قورئان درێژ بکەوە، چونکە مانەوەی زۆر لە خزمەت قورئاندا، دەبێتە هۆی خۆشەویستی زیاتر و هۆگریت بۆی.

## ٣ له ڕێزگرتنی خوایه كه ڕێز بگیرێ له هه‌ڵگرانی قوڕئان



٣- عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنْ إِجْلَالِ اللَّهِ إِكْرَامَ ذِي الشَّيْبَةِ الْمُسْلِمِ، وَحَامِلِ الْقُرْآنِ غَيْرِ الْغَالِي فِيهِ وَالْجَافِي عَنْهُ، وَإِكْرَامَ ذِي السُّلْطَانِ الْمُقْسِطِ»[1].

واته: ئه‌بو مووسای ئه‌شعه‌ریی ﵁، ده‌ڵێ: بیستم پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ده‌یفه‌رموو: «بێگومان له ڕێزگرتنی خوایه كه ڕێزی مسوڵمانێكی پیری موو سپی بگیرێ، وه ڕێزی كه‌سێك بگیرێ كه هه‌ڵگری قوڕئانه (واته: له‌به‌ریه‌تی و كاری پێده‌كات) زێده‌ڕۆیی تێدا ناكات، وه كه‌مته‌رخه‌میشی تێدا ناكات، وه ڕێزگرتنی خاوه‌ن پۆست و ده‌سه‌ڵاتداری دادپه‌روه‌ر».

(١) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ: ٤٨٤٣، وَالبَيْهَقِيُّ: ١٦٤٣٥، انظر: صَحِيح الجَامع: ٢١٩٩، صَحِيح التَّرْغِيب وَالتَّرْهِيب: ٩٨.

## ❋ مانای زمانەوانی ❋

(مِنْ إِجْلاَلِ اللَّهِ): واتە: بە گەورەگرتن و ڕێزگرتنی خوا.

(الْغَالِي): واتە: زێدەڕۆیی کردن و لە سنوور دەرچوون.

(الْجَافِي): واتە: وشکی و پچڕاندنی پەیوەندی و چاکەکارییە.

## ❋ پەیامە پەروەردەییەکان ❋

• لە بە گەورەگرتنی قورئان ئەوەیە کە مامناوەند بیت لە وەرگرتنی قورئان، بەبێ زێدەڕۆیی و کەمتەرخەمی.

• لە بە گەورەگرتنی خوا ئەوەیە فەرمایشتەکەی بە مەزن بگیرێ، وە لە بە گەورەگرتنی فەرمایشتی خوا ئەوەیە کە ڕێز لە هەڵگرانی بگیرێ، بەڵام زێدەڕۆیی تێدا کردن، یان کەمتەرخەم بوون بەرانبەری، ئا ئەوە بە گەورەگرتنی خواو فەرمایشتەکەی تێک دەدات.

## ❋ ڕێنماییە کردارییەکان ❋

• قورئان بە مەزن بگرەو بەرزی بکەرەوە بۆ پێگەی خۆی کە شایستەیەتی.

• سووربە لەسەر مامناوەند بوون و هاوسەنگ بوون لە وەرگرتنی قورئان و خوێندنەوەی و کارپێکردنی.

• واز مەهێنە لە قورئان و خوێندنەوەی، چونکە بەڕاستی ئەمە کەمتەرخەمی ڕاستەقینەیە بەرانبەر بە فەرمایشتی خوای پایەدار.



٤- عَنْ عَامِرِ بْنِ وَاثِلَةَ: أَنَّ نَافِعَ بْنَ عَبْدِ الْحَارِثِ لَقِيَ عُمَرَ بِعُسْفَانَ، وَكَانَ عُمَرُ يَسْتَعْمِلُهُ عَلَى مَكَّةَ، فَقَالَ: مَنِ اسْتَعْمَلْتَ عَلَى أَهْلِ الْوَادِي؟ فَقَالَ: ابْنَ أَبْزَى. قَالَ: وَمَنِ ابْنُ أَبْزَى؟ قَالَ: مَوْلًى مِنْ مَوَالِينَا. قَالَ: فَاسْتَخْلَفْتَ عَلَيْهِمْ مَوْلًى؟ قَالَ: إِنَّهُ قَارِئٌ لِكِتَابِ اللَّهِ ﷻ، وَإِنَّهُ عَالِمٌ بِالْفَرَائِضِ. قَالَ عُمَرُ: أَمَا إِنَّ نَبِيَّكُمْ ﷺ قَدْ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ يَرْفَعُ بِهَذَا الْكِتَابِ أَقْوَامًا، وَيَضَعُ بِهِ آخَرِينَ».

أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٨١٧.

واتە: عامڕی کوڕی واسیلە، دەگێڕێتەوە: نافیعی کوڕی حاریس لە عوسفان گەیشتە عومەر ﵁، - کە کردبووی بە کاربەدەست لە مەککە -، گوتی: کێت (لە شوێنی خۆت) کردوە بە کاربەدەست بەسەر خەڵکی مەککەوە؟ گوتی: ئیبنو ئەبزا، (عومەر ﵁) گوتی: ئیبنو ئەبزا کێیە؟ گوتی: یەکێکە لە مەولاکانمان، ئەویش ﵁ گوتی: مەولایەکت کردوە بە کاربەدەست بەسەریانەوە؟ (نافیعی کوڕی حاریس)یش گوتی: بە دڵنیایی ئەو خوێنەری کتێبی خوایـە، وە زاناو شارەزایە لە بابەتی میرات، (عومەر ﵁) گوتی: بێگومان پێغەمبەرەکەتان ﷺ فەرموویەتی: «بە دڵنیایی خوا کۆمەڵێک بەرز دەکاتەوە بە هۆی ئەم کتێبە (واتە: قورئان)، وە هەندێکی دیکەشی پێ نزم دەکاتەوە».



## ❀ مانای زمانەوانی ❀

(يَرْفَعُ): واتە: بەرز دەکاتەوە، وشەی (رَفع) پێچەوانەی وشەی (وَضْع، خَفض)ـە. (يَضَعُ) لە (وَضع)ـەوەیە، کە بریتیە لە دانان و نزم کردنەوەی شتێک.

## ❀ پەیامە پەروەردەییەکان ❀

• گەورەیی قورئان لەوە ڕەنگ دەداتەوەو دەدرەوشێتەوە، کە بەرزیە بۆ هەڵگرەکەی و دەست پێوەگرەکەی لە دونیاو دواڕۆژ.

• تۆ پێگەی خۆت بەرزو بەهێز دەکەی کاتێک لەگەڵ قورئان دەبیت.

• پێوەری بەهێزی ڕاستەقینە لە دەستگرتن دایە بە قورئانەوە.

## ❀ ڕێنماییە کردارییەکان ❀

• لەگەڵ قورئان بە، دەستی پێوەبگرە، لە سەلامەتی و ئارامیدا دەبیت.

• با قورئان پەیژەی سەرکەوتن و بەرزبوونەوەت بێت لە دونیاو دواڕۆژدا.

• لەگەڵ هەڵگرانی قورئان بەو دۆستایەتیان بکە، چونکە کەسانی خاوەن پێگەو پلەی تایبەتن.

## ٥ لەکاتی خوێندنی قورئان سەکینەت دادەبەزێ



٥- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﵄، قَالَ: كَانَ رَجُلٌ يَقْرَأُ سُورَةَ الْكَهْفِ، وَعِنْدَهُ فَرَسٌ مَرْبُوطٌ بِشَطَنَيْنِ، فَتَغَشَّتْهُ سَحَابَةٌ، فَجَعَلَتْ تَدُورُ، وَتَدْنُو، وَجَعَلَ فَرَسُهُ يَنْفِرُ مِنْهَا، فَلَمَّا أَصْبَحَ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: «تِلْكَ السَّكِينَةُ تَنَزَّلَتْ لِلْقُرْآنِ»[1].

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﵄، دەڵێ: پیاوێک سوورەتی کەهفی دەخوێند، ئەسپێکی لەلا بوو، بە دوو پەتان بەسترابۆوە، (لە کاتی قورئان خوێندنەکە) هەور لە سەروویەوە دایپۆشی و لێی نزیک بوویەوە، ئەمەش وایکرد ئەسپەکەی لێ دووربکەوێتەوە (بترسێ)، دوایی کە ڕۆژ بووەوە (بەیانی داهات)، هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بۆ باس کرد، ئەویش ﷺ فەرمووی: «ئەوە ئارامیی و سەکینەت بوو دابەزیوە بە هۆی قورئان خوێندنەکە».

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٨٥٣٢، وَالبُخَاري: ٨٣٩، وَمُسْلِم: ٧٩٥، وَغَيْرُهُمْ.



## ❁ مانای زمانەوانی ❁

(بِشَطَنَيْنِ): واتە: (مثنى)ى (شَطَن)ـە، یانی: دوو پەت، (بِشَطَنِ): بریتیە لە گوریسێکی درێژ.

(فَتَغَشَّتهُ): واتە: داپۆشینی شتێکە بە شتێکی تر، (غِشَاء): بریتیە لە داپۆشین.

(السَّكِينَةُ): بریتیە لە ئارامی و سەنگینی، کە پێچەوانەی شپرزەیی و جووڵە جووڵە، وە دەشگوترێ: مەبەست بە (سكِينَة): فریشتەیە.

## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

• هەستکردنی قورئان خوێن بە نزیکی فریشتەکان، ئارامی و سەنگینی و هەستکردن بە لەگەڵدابوونی خوای پێ دەبەخشێت.

• (دەستگرتن بە) قورئان دەرمانە بۆ نەهێشتنی دوودڵی و، ترسان لە داهاتوو.

• قورئان خوێندنەوە لە ماڵ هۆکاری ئارامیی و سەلامەتییە بۆ خاوەنی ئەو ماڵە.

## ❁ ڕێنماییە کردارییەکان ❁

• با لە ماڵەوە کاتێکت هەبێ بە تەنها بمێنیەوە لەگەڵ قورئان و بیخوێنیەوە.

• ماڵەکەت ئاوەدان بکەرەوە بە ئارامیی و سەنگینی بە هۆی خوێندنەوەی قورئانەوە.





## گەورەیی پاداشتی خوێندنەوەی قورئـــان



٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَرَأَ حَرْفًا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ فَلَهُ بِهِ حَسَنَةٌ، وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، لاَ أَقُولُ ﴿ الٓمٓ ﴾ حَرْفٌ، وَلَكِنْ أَلِفٌ حَرْفٌ، وَلاَمٌ حَرْفٌ، وَمِيمٌ حَرْفٌ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﵁، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەس پیتێک لە کتێبی خوا (واتە: قورئان) بخوێنێ چاکەیەکی بۆ هەیە، هەر چاکەیەکیش بە دە ئەوەندەی خۆی دەنووسرێ، ناشڵێم ﴿ الٓمٓ ﴾ هەمووی یەک پیتە، بەڵکو ئەلیف پیتێکە و، لام پیتێکە و، میم پیتێکە».

---

(١) أَخْرَجَهُ التِّرمِذيُّ: ٢٩١٠، وَقَالَ: حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَأَخْرَجَهُ البَيْهَقِي في شعب: ٢٩٩٣٣، انظر: صَحِيح الْجَامِع: ٦٤٦٩، الصَّحِيحَة: ٣٣٢٧.



## ❁ مانای زمانەوانی ❁

(بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا): واتە: بە چەند بەرانبەر، (مِثْل) بە مانای وەکو یەک بوونی دوو شت دێت.

(الْحَسَنة): (حَسَن): واتە: جوانی کە دژی (قُبْح)ـە، واتە: ناشیرینی، (الْحَسَنَةُ) هەموو چاکەیەک دەگرێتەوە لە گوفتارو کرداردا.

## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

• خوێنەری قورئان بە هەر پیتێک لە فەرمایشتی خوای گەورە کە دەیخوێنێتەوە پاداشتێکی چەند ئەوەندەی بۆ هەیە.

• فراوانی ڕەحمەتی خوا لەو کاتەیە کە پاداشت چەند قات دەکاتەوە بۆ بەندەکەی، بە فەزڵ و بەخششی خۆی.

• لە گەورەیی قورئان ئەوەیە کە گەنجینەیەکە بۆ (بەدەستهێنانی) چاکەکان.

## ❁ ڕێنماییە کردارییەکان ❁

• قورئان بخوێنە لەبەر ئەوەی خوێندنەوەکەی دەبێتە هۆی زیادبوونی چاکەکانت.

• لە کاتی خوێندنەوەت بۆ قورئان هەست بەوە بکە پاداشت کۆدەکەیتەوە.



٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرو رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهُ: «اقْرَإِ الْقُرْآنَ فِي شَهْرٍ»، قَالَ: إِنِّي أَجِدُ قُوَّةً، قَالَ: «اقْرَأْ فِي عِشْرِينَ»، قَالَ: إِنِّي أَجِدُ قُوَّةً، قَالَ: «اقْرَأْ فِي خَمْسَ عَشْرَةَ»، قَالَ: إِنِّي أَجِدُ قُوَّةً، قَالَ: «اقْرَأْ فِي عَشْرٍ»، قَالَ: إِنِّي أَجِدُ قُوَّةً، قَالَ: «اقْرَأْ فِي سَبْعٍ، وَلاَ تَزِيدَنَّ عَلَى ذَلِكَ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: «قورئان بخوێنە لە ماوەی مانگێکدا»، وتی: من لەوە زیاتر دەتوانم، فەرمووی: «لە ماوەی بیست ڕۆژ بیخوێنە»، وتی: من لەوە زیاتر دەتوانم، فەرمووی: «لە ماوەی پازدە ڕۆژ بیخوێنە»، وتی: من لەوە زیاتر دەتوانم، فەرمووی: «لە ماوەی دە ڕۆژ بیخوێنە»، وتی: من لەوە زیاتر دەتوانم، (دواجار پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو:) «لە ماوەی حەوت ڕۆژ بیخوێنەو، لەوە زیاتری مەکە»[٢].

---

(١) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ: ١٣٨٨، قال شُعَيب الأرنؤوط: إسناده صحيح. وَعِنْدَ البُخَارِي رَحْمَةُ اللَّهِ، قَالَ: إِنِّي أُطِيقُ أَكْثَرَ فَمَا زَالَ حَتَّى قَالَ: «فِي ثَلاَثٍ»، وَعِنْدَ أَبِي دَاوُدَ رَحِمَهُ اللَّهِ، قَالَ: «لَا يَفْقَهُ مَنْ قَرَأَهُ فِي أَقَلَّ مِنْ ثَلَاثٍ» يَعْنِي: الْقُرْآنَ.

(٢) (واتە: مەڵێ هێشتا توانام هەیە لە ماوەیەکی کەمتر خەتمی بکەم و بیخوێنم).



## ❁ مانای زمانەوانی ❁

(إِنِّي أَجِدُ قُوَّةً): (قُـوَّة) واتە: بەهێزیی، کە دژی (ضُعف)ـە، واتە: بێهێزیی، (قُوَّةً): بریتیە لە هێزو توانین.

(أُطِيقُ): دەگوترێ: (أَطَاقَ الْعَمَلُ) واتە: توانای لەسەر ئەنجامدانی کارەکە هەیەو بەرگەی قورساییەکانی دەگرێت.

(لا يَفْقَهُ): (فقْه): بریتیە لە هەبوونی زانیاری بە شتێک و تێگەیشتن لێی.

## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

- (ئەم فەرمووده) بە سۆزو بەزەیی پێغەمبەری خوا ﷺ پێشان دەدات بەرانبەر بە ئۆممەتەکەی.
- لەبەگەورەگرتنی قورئان بەردەوام خوێندنەوەو دانەبڕانە لێی.
- لە تەواوی بە گەورە دانانی قورئان تێگەیشتنە لە بێژەو ماناو مەبەستەکانی.
- لە تەواوی بە گەورە دانانی قورئان تەواوکردنیەتی لەماوەی مانگێکدا.
- هاوەڵانی قورئان خاوەن ورەو وزەیەکی زۆر بەرزن لەگەڵ قورئاندا.

## ❁ ڕێنماییە کردارییەکان ❁

- پێویستە مامۆستای قورئان، سوور بێ بە نواندنی سۆزو بەزەیی بەرانبەر ئەوانەی کە فێری قورئانیان دەکات.
- سووربەلەسەرئەوەی قورئان بەتێگەیشتن لەماناو مەبەستەکانی بخوێنیەوە.
- بە پێی توانای خۆت، با کاتێکی دیاریکراوت هەبێ، بۆ خەتم و تەواو کردنی هەموو قورئان.

## ٨ فەزڵی ئەوماڵەی قوڕئانی تێدا دەخوێنرێ



٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّهُ قَالَ: «إِنَّ الْبَيْتَ لَيَتَّسِعُ عَلَى أَهْلِهِ، وَتَحْضُرُهُ الْمَلَائِكَةُ وَتَهْجُرُهُ الشَّيَاطِينُ، وَيَكْثُرُ خَيْرُهُ، أَنْ يُقْرَأَ فِيهِ الْقُرْآنُ، وَإِنَّ الْبَيْتَ لَيَضِيقُ عَلَى أَهْلِهِ وَتَهْجُرُهُ الْمَلَائِكَةُ، وَتَحْضُرُهُ الشَّيَاطِينُ، وَيَقِلُّ خَيْرُهُ، أَنْ لَا يُقْرَأَ فِيهِ الْقُرْآنُ».

أَخْرَجَهُ الدَّارِمِيُّ: ٣٣٠٩، مَوقُوفاً، إِسْنَادُهُ صَحِيحٌ.

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁، گوتوویەتی: «خانوو فراوان دەبێ لەسەر خاوخێزانی (قوڕئانخوێن)و، فریشتەکان تێدا ئامادەدەبن و، شەیتانەکان لێی دەچنەدەرو جێی دەهێڵن، وە خێروچاکەی زۆر دەبێ، ئەگەر قوڕئانی تێدا بخوێنرێ، وە بێگومان خانوو (هەر چەند گەورەش بێ) تەنگ و تەسک دەبێ لەسەر خاووخێزانەکەی (خاوەنەکەی)و فریشتەکان جێی دەهێڵن و لێی کۆچ دەکەن و، شەیتانەکان تێیدا ئامادە دەبن، وە خێرو چاکەی کەم دەبێ، ئەگەر قوڕئانی تێدا نەخوێنرێ».

### ❁ مانای زمانەوانی ❁

(لَيَتَّسِعُ): وشەی (وُسع) واتە: فراوانی، پێچەوانەی وشەی: (ضَيْق) و (عُسْر)ـە، واتە: تەنگ و تەسک، وشەی (السعة) بە واتای دەوڵەمەندیشە.

(لَيَضِيقُ): پێچەوانەی (السعة)یە، کە بریتیە لە تەسک و تەنگی، وە (الضيقة) بە مانای هەژاریشە.

(تَهْجُرُهُ): وشەی (هَجْر) بە مانای بچڕاندن دێ و دژی (وَصْل)ـە، واتە: گەیاندن.

(تَحْضُرُهُ): واتە: ئامادە دەبێ.

## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

• خوێندنەوەی قورئان لە ماڵدا سینەکان گوشاد دەکات و، ماڵەکان فراوان دەکات.

• لە گەورەییەکانی قورئان ئەوەیە دەبێتە هۆکار بۆ بەرەکەت و خێر هاتنە نێو ماڵ و، ئامادەبوونی فریشتە تیایدا.

• نەخوێندنی قورئان لە ماڵەکاندا هۆکاری چوونە دەرەوەی فریشتەکانە تیایداو، ئامادەبوونی شەیتانەکانەو نەهێشتنی پیت و پێز و بەرەکەتە لەم ماڵەدا.

## ❁ ڕێنماییە کردارییەکان ❁

• زیکرێکی تایبەتی ڕۆژانەت هەبێت لەگەڵ قورئاندا لە ماڵ.

• ئەگەر لە ماڵدا دەرگای کێشەو گرفتت زۆر بوون، ئەوە ڕوو لە خوێندنی قورئان بکە، چونکە قورئان چارەسەرە.

• ئامۆژگاری خاوو خێزان و منداڵەکانت بکە بە خوێندنەوەی قورئان لە ماڵەوە، چونکە ماڵت فراوان دەکات و، پیت و پێزو بەرەکەتی زۆر دەکەوێتە نێو ماڵەکە.

## ٩ قورئـان هـاوەڵەكەی بـەرز دەكاتەوە بە پلەكانی بەهەشتدا



٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُقَالُ لِصَاحِبِ الْقُرْآنِ: اقْرَأْ وَارْتَقِ وَرَتِّلْ، كَمَا كُنْتَ تُرَتِّلُ فِي الدُّنْيَا، فَإِنَّ مَنْزِلَكَ عِنْدَ آخِرِ آيَةٍ تَقْرَؤُهَا»[(١)].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەمرٍ رضي الله عنهما، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هاوەڵی قورئان كە دەچێتە بەهەشت پێی دەگوترێ: بخوێنەو بەرز بەوەو سەربكەوە، هەروەک لە دونیادا دەتخوێند، بێگومان شوێنی تۆ لە لای دوا ئایەتە كە دەیخوێنی».

(١) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ: ١٤٦٤، والتِّرمِذِيُّ: ٢٩١٤، وَابْنُ مَاجَه: ٣٧٨٠، وَقَالَ التِّرمِذِيُّ: حَسَنٌ صَحِيحٌ.



## ❁ مانای زمانەوانی ❁

(ارْتَقِ): واتە: سەرکەوتن و بەرزبوونەوە، وەک قسەی تۆ کە دەڵێی: بە پەیژە سەرکەوتم (لە فیعلی): «أرقی رُقیّاً»ـەوەیە.

(رَتِّلْ): واتە: خوێندنەوەی ڕێک و لەسەرخۆو ئارام، هەروەها دەرخستنی پیتەکان و حەرەکەکانە.

## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

• لە مەزنی و گەورەیی قورئان ئەوەیە: کە بۆ خاوەنەکەی بەرەکەت و پلەو پێگەیە، هەم لە دونیاو، هەم لە دوارۆژ.

• قورئان هۆکارە بۆ بەرزبوونەوەی پلەکان لە ڕۆژی دواییدا.

• جوان خوێندنەوەی قورئان هۆکاری بەرزبوونەوەی پلەوپێگەی قورئانخوێنە لە ڕۆژی دوایی.

## ❁ ڕێنماییە کردارییەکان ❁

• زۆر هاوەڵێتی قورئان بکە، بە جوان خوێندنەوەو کارپێکردنی، چونکە پێی دەناسرێیەوە (لە دونیاو دوارۆژدا).

• دەنگت خۆش بکە لە کاتی خوێندنەوەی قورئان.

# ١٠ قورئان بەرگری دەکات لە هاوەڵەکەی لە ڕۆژی دوایی



١٠- عَنِ النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ الْكِلَابِيِّ رضي الله عنه، يَقُولُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «يُؤْتَى بِالْقُرْآنِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَأَهْلِهِ الَّذِينَ كَانُوا يَعْمَلُونَ بِهِ، تَقْدُمُهُ سُورَةُ الْبَقَرَةِ وَآلِ عِمْرَانَ»، وَضَرَبَ لَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثَلَاثَةَ أَمْثَالٍ مَا نَسِيتُهُنَّ بَعْدُ، قَالَ: «كَأَنَّهُمَا غَمَامَتَانِ، أَوْ ظُلَّتَانِ سَوْدَاوَانِ بَيْنَهُمَا شَرْقٌ، أَوْ كَأَنَّهُمَا حِزْقَانِ مِنْ طَيْرٍ صَوَافَّ تُحَاجَّانِ عَنْ صَاحِبِهِمَا»[1].

واتە: نەوواسی کوڕی سەمعانی کیلابی رضي الله عنه دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: «قورئان دەهێنرێ لەگەڵ ئەو کەسانەی خوێندوویانەو کاریان پێکردوە، جا سوورەتی بەقەڕەو ئالی عیمڕان پێشی دەکەون» جا پێغەمبەری خوا ﷺ سێ وێنەو نموونەی بۆ (ئەم دوو سوورەتە هێنانەوە) لە دوای بیستنیان لە بیرم نەچوونەوە، فەرمووی: «وەک دوو پەڵە هەور، یان دوو سێبەری ڕەشن ڕووناکی لە نێوانیانە، یاخود وەک دوو کۆمەڵە باڵندەی باڵکراوەن، بەڵگە دەهێنەوەو بەرگری لە هاوەڵەکانیان دەکەن».

---

(١) أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٨٠٥.



## ❁ مانای زمانەوانی ❁

(غَمَامَتَانِ): واتە: دوو پارچە هەور.

(شَـرْقٌ): بە مانای ڕووناکی و کەلێن دێت، کە بریتیە لە خۆر.

(حِزْقَانِ): وشەی (حِزْق): بریتیە لە کۆمەڵ و کۆبوونەوەی هەر شتێک.

(صَوَافَّ): باڵەکانیان درێژ دەکەن و، دەیکەنەوە و ڕێک ڕایدەگرن لە کاتی فڕین.

## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

• لە بە مەزن گرتنی قورئان کارپێکردنیەتی، کارکردن بە قورئان هۆکارێکە بۆ ئەوەی قورئان بەرگریکارت بێت لە ڕۆژی دواییدا.

• نموونەی زۆر هێنانەوە بۆ قورئان (وەك: هەور، باڵندە، سێبەر، هتد..) پلەو پێگەی قورئان و خێروبێرە گشتیەکەی بۆ خەڵک نزیک دەکاتەوەو ڕووندەکاتەوە.

## ❁ ڕێنماییە کردارییەکان ❁

• هەوڵبدە کار بکەی بە هەر ئایەتێک کە فێری بووی، ئەگەر لە هەموو ژیانتدا جارێکیش بێت، سووربە لەسەر خوێندنی هەردوو سوورەتی بەقەرەو ئالی عیمران و کار بە نێوەڕۆکەکانیان بکە.

• وێنەو نموونەی هەمەجۆر بهێنەوە بۆ قورئان، بە تایبەتی لە کاتی ڕوونکردنەوەی پلەو پێگەی قورئان بۆ خەڵک (وەکو چۆن پێغەمبەر ﷺ کە باسی بەقەرەو ئالی عیمرانی کردوە بە دوو پۆل باڵندە، بە دوو پارچە هەور وەسفی کردوون، واتە: کاتێک باسی گەورەیی قورئان دەکەی نموونەی بۆ بهێنیەوە تا کەسی بەرانبەر ئاسان تێت بگات).

## ١١ قورئان گەورەترین موعجیزەی پێغەمبەرە ﷺ



١١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا مِنَ الأَنْبِيَاءِ مِنْ نَبِيٍّ إِلاَّ قَدْ أُعْطِيَ مِنَ الآيَاتِ مَا مِثْلُهُ آمَنَ عَلَيْهِ الْبَشَرُ، وَإِنَّمَا كَانَ الَّذِي أُوتِيتُ وَحْياً أَوْحَى اللَّهُ إِلَيَّ، فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكْثَرَهُمْ تَابِعاً يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هیچ یەکێک لە پێغەمبەران نەبووە، حەتمەن ئەو پێغەمبەرە هەندێک بەڵگەو نیشانەی پێدراون کە مرۆڤ بڕوای پێ هێناوە بەهۆی ئەم بەڵگەو نیشانانەوە، وە بە دڵنیایی ئەوەی بە من دراوە بریتیە لە وەحی کە خوا بۆی سرووش کردووم، ئومێدەوارم من لەو (پێغەمبەرانە) بم کە زۆرترین کەس شوێنکەوتەین لە ڕۆژی دواییدا».

---

(١) أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ١٥٢.



## ❁ مانای زمانەوانی ❁

(مَـا مِثْلُهُ آمَـنَ عَلَـيْهِ الْبَشَـرُ): واتە: هەموو پێغەمبەرێک بەڵگەو موعجیزەیەک، یان زیاتری پێ دەدرێ کە موعجیزەکە بە جۆرێکە هەرکەس بیبینێ بەهۆیەوە بڕوا بە پێغەمبەرەکە دێنێ.

(وَحْيَـاً): بە مانای پێدانی زانیارییە بە پەنهانی و شاراوەیی، (بەڵام لێرەدا) وەحی بریتیە لە قورئان و پێغەمبەرایەتی.

(تَابِعَـاً): واتە: ئەوەی دواتر دێت، (لێرەدا واتە: شوێنکەوتە).

## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

• قورئانی بەڕێز ئامرازێکی زیندووی بانگەوازەو زۆرترین کاریگەری هەیە.

• قورئان کە وەحی خوایە، گەورەترین خەڵاتی خوای پەروەردگارە بۆ ئەم ئۆممەتە.

• بەڵگەو ڕوونبوونەوەو دەرئاسا (مُعْجِزَه)کان بەردەوام لە نوێبوونەوەدان لە قورئاندا تا ڕۆژی دوایی.

## ❁ ڕێنماییە کردارییەکان ❁

• قورئان بکە یەکەمین ئامرازی بانگەواز و ڕوون کردنەوە.

• سوپاسی خوا بکە لەسەر نیعمەتی قورئان، وە لەو کەسانە بە کە بانگەوازی بۆ دەکەن و، خەڵکی بۆلا بانگ دەکەن.





## ١٢ به مەزنگرتنی قورئان پارێزرانیەتی لە سوکایەتی پێکردن



١٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ: «كَانَ يَنْهَى أَنْ يُسَافَرَ بِالْقُرْآنِ إِلَى أَرْضِ الْعَدُوِّ مَخَافَةَ أَنْ يَنَالَهُ الْعَدُوُّ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: لە پێغەمبەری خوا ﷺ کەوا «ڕێگری کردوە لە گەشتکردن و ڕۆیشتن بۆ خاکی دوژمن بە قورئانەوە، لە ترسی ئەوەی کە بکەوێتە دەستی دوژمن (نەوەک سوکایەتی پێبکەن)».

(١) أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ١٨٦٩.



## ❁ مانای زمانەوانی ❁

(يُسَافِرَ): وشەی (سَفَر): بریتیە لە گواستنەوە لە شوێنێک بۆ شوێنێکی دیکە، هەروەها بە مانای دەرکەوتن و ئاشکراش دێت.

(أَرْضِ العَدُوِّ): ئەو زەویەیە کە لە ژێر دەسەڵات و فەرمانڕەوایی بێبڕوایاندایە.

## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

• قەدەغەکردنی هەر شتێک کە هۆکاری سووکایەتی بێت بۆ قورئانی بەڕێزو، بە گەورەنەگرتنی، لە بابەتی ڕێگری کردنە لەو ڕێگایانەی بەرەو خراپە دەڕۆن.

• لە تەواوی بە مەزن دانانی قورئان ئەوەیە: بە دوور بگیرێ لە هەرچی کەم و کورتی و ناتەواوی هەیە هەرچەندە ئەگەرو پێشبینیش بێ.

## ❁ ڕێنماییە کردارییەکان ❁

• پارێزگاری لە قورئان بکە، لە هەر شتێک کە دەبێتە هۆی ناتەواوی پاڵدانە لای قورئان و، بێ ڕێزی و، بە سووک سەیر کردنی.

• لە شوێنێک قورئان دابنێ، کە شایستەو گونجاو بێت بۆ گەورەیی پێگەکەی.

## دەستگرتن بە قورئان هۆكاری ڕێنمایی و ڕزگارییە



١٣- عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْخُزَاعِيِّ رضي الله عنه، قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «أَبْشِرُوا وَأَبْشِرُوا أَلَيْسَ تَشْهَدُونَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ»؟ قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: «فَإِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ سَبَبٌ طَرَفُهُ بِيَدِ اللَّهِ وَطَرَفُهُ بِأَيْدِيكُمْ، فَتَمَسَّكُوا بِهِ، فَإِنَّكُمْ لَنْ تَضِلُّوا، وَلَنْ تَهْلِكُوا بَعْدَهُ أَبَداً»[1].

واتە: ئەبو شورەیحی خوزاعی رضي الله عنه، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەدەر بۆ لامان، جا فەرمووی: «موژدە بدەن، موژدە بدەن، ئایا ئێوە شایەدی ئەوە نادەن کە جگە لە خوا پەرستراوی دیکە نیەو منیش پێغەمبەری خوام»؟ گوتیان: بەڵێ (شایەدی دەدەین)، فەرمووی: «دە دڵنیابن ئەم قورئانە پەتێکە لایەکی بە دەستی خواوەیە، وە لایەکەی دیکەی بە دەستی ئێوەوەیە، توند دەستی پێوەی بگرن، (ئەگەر توند پێوە پابەندبن) دوای ئەوە هەرگیز گومڕانابن و، لە ناوناچن».

---

(١) أَخْرَجَهُ ابْنُ حِبَّان: ١٢٢، قَالَ شُعَيْب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ حَسَن عَلَى شُرطِ مُسْلِم.



## ❁ مانای زمانەوانی ❁

(سَبَبُ): پەت و گوریسە، کە بە مانای درێژی و درێژبوونەوە دێت.

(طَرَفُهُ): یانی: سنوور و لێواری شتێک.

(تَضِلُّوا): بریتیە لە نەمانی شتێک و ڕۆیشتنی بە شێوەیەکی ناهەق.

## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

• موژدەدان و دڵخۆش کردنی خەڵک بە چاکە لە ڕێبازو سوننەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

• قورئانی بەڕێز ڕێگەی ڕزگاریە بۆ مرۆڤ وجن تا ڕۆژی دوایی.

• لە بە مەزن دانان و بە گەورەگرتنی قورئانە کە دەستی پێوە بگری، چونکە بە دڵنیایی ڕزگارت دەکات لە گومڕایی و لەناوچوون.

## ❁ ڕێنماییە کردارییەکان ❁

• لە کاتی هەر کێشەو گرفتاریەک بگەڕێوە بۆ قورئان، ڕێگەیەکی ڕووناکەو، ڕێنمایی تەواوت دەست دەکەوێ.

• لە کاتی زۆربوونی ئاشووب و ناخۆشیەکان، زیاتر بە قورئانەوە پەیوەستبە و پەیوەندیت لەگەڵی پتەو بکە.

• هەست بە نزیکی و پەیوەندیت بکە بە خواوە لە کاتی دەستگرتنت بە قورئانەوە.





١٤- عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْقُرْآنُ شَافِعٌ مُشَفَّعٌ، وَمَاحِلٌ مُصَدَّقٌ، مَنْ جَعَلَهُ أَمَامَهُ قادَهُ إِلَى الْجَنَّةِ، وَمَنْ جَعَلَهُ خَلْفَهُ سَاقَهُ إِلَى النَّارِ»(١).

واتە: جابر رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «قورئان تکاو شەفاعەت دەکات و تکاکەشی لێ وەردەگیرێ، وە بەرگری دەکات و بەڕاست دادەنرێ، بۆیە هەر کەس (لە دونیا) پێش خۆی خستبێ، ئەوە ڕێنوێنی دەکات بۆ بەهەشت، وە هەر کەسیش (لە دونیا) دوای خۆی خستبێ، ئەوە دەیداتە پێش خۆی بۆ نێو ئاگر».

---

(١) أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِيُّ في «الكبير»: ٨٦٥٥، وَابْنُ حِبَّان: ١٢٤، وَالبَزَّارُ: ١٢٢، انظر: صَحِيح الْجَامِع: ٤٤٤٣.



## ❁ مانای زمانەوانی ❁

(شَافِعٌ مُشَفَّعٌ): (الشَّفَاعَة): تکاکردن لەو شتانەی پەیوەندی بە دونیاو دوارۆژەوە هەیە بریتیە لە: داواکردنی بورین و لێخۆشبوون لە گوناهو تاوانی نێوانیان، (الْمُشَفَّع)یش ئەو کەسەیە کە تکایەکەی وەردەگیرێ.

(مَاحِلٌ مُصَدَّقٌ): واتە: بەرگریکارو موناقەشەکاری بە ڕاست دانراو.

## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

- قورئان ڕێ پیشاندەرەو، خاوەنەکەی بەرەو بەهەشت دەبات.
- قورئان هاوەڵێکی زۆر وەفادارو بە ئەمەکە بۆ هاوەڵەکەی، بێگومان تکای بۆ دەکات و بەرگریشی لێ دەکات.
- پشت هەڵکردن لە قورئان و، بێ ئاگابوون لێی ڕێگەی چوون بەرەو ئاگری دۆزەخە.

## ❁ ڕێنماییە کردارییەکان ❁

- سووربە لەسەر ئەوەی کە قورئان ڕێ پیشاندەرت بێ بۆ هەموو کاروبارەکانی ژیانت.
- وریابە لە پشت هەڵکردن لە قورئان، لەبەر ئەوەی هۆکاری زەرەرمەندییە.

# ١٥ به مــەزنگرتنی قورئــان خوێندنیەتی له شەونوێژدا، ئەگەر کەمێکیش بێ



١٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَامَ بِعَشْرِ آيَاتٍ لَمْ يُكْتَبْ مِنَ الْغَافِلِينَ، وَمَنْ قَامَ بِمِائَةِ آيَةٍ كُتِبَ مِنَ الْقَانِتِينَ، وَمَنْ قَامَ بِأَلْفِ آيَةٍ كُتِبَ مِنَ الْمُقَنْطِرِينَ»[١].

واته: عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕی کوڕی عاص رضي الله عنهما، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «هەر کەسێک (شەو) هەڵسێ دە ئایەت بخوێنی ئەوە لە بێئاگایان بەرانبەر زیکری خوا نانووسرێ، وە هەر کەسێک (شەو) هەڵسێ سەد ئایەت بخوێنی لە گوێڕایەڵان (بۆ فەرمانی خواو پێغەمبەر ﷺ) دەنووسرێ، وە هەر کەسێک (شەو) هەڵسێ هەزار ئایەت بخوێنێ، ئەوە پاداشتێکی یەکجار زۆری بۆ دەنووسرێ، (بە ئەندازەی ئاسمانەکان و زەوی)».

## ❁ مـانـای زمانەوانـی ❁

**(الغَافِلِينْ): (غفلة) وازهێنانە لە شتێک بە بێئاگایی، جاری واش هەیە بە ئەنقەستە.**

---

(١) أَخْرَجَهُ أَبُو دَوُدَ: ١٣٩٨، انظر: «الصحيحة»: ٦٤٢.

(الْقَانِتِينْ): وشەی (قنوت) گوێڕایەڵی و چاکەکارییە لە دینداریيدا، وە هەموو ڕاستەڕێگرتنێک لە دینداریيدا پێی دەگوترێ: (قنوت)، وە بە زۆر وەستان بۆ نوێژیش وتراوە (قنوت).

(الْمُقَنْطِرِينَ): لەوانەن کە بە ئەندازەی یەک (قنْطَار) پاداشتیان هەیە، (قنْطَار)یش بریتیە لە ماڵ و سامانێکی زۆر، بەڵام دەربارەی ئەندازەکەی ڕاجیایی هەیە، جا مەبەستەکە لێرەدا ئەوەیە: ئەو کەسانەن کە گەیشتوون بە پاداشت و چاکەی زۆر.

## پەیامە پەروەردەییەکان

- ڕێبوارانی ڕێگەی خوا بە پەیوەستبوون و نزیکیان لە کتێبی خواوە دەناسرێنەوە.
- گەورەترین پەیوەستبوون بە قورئان بریتیە: لە هەڵسانەوە لە شەوداو، خوێندنی لە نوێژدا، ئەگەر چەند ئایەتێکی کەمیش بێت.

## ڕێنماییە کردارییەکان

- سووربە لەسەر شەونوێژکردن و، قورئان تێدا خوێندنی، ئەگەر بە خوێندنی دە ئایەتیش بێت.
- پێشبڕکێ بکەو بەرز بەوە بۆ پێگەی ڕێبوارانی ڕێگەی خوا، بە هۆی پەیوەستیت بە قورئانەوە، چونکە ئەمە دەوڵەمەندی ڕاستەقینەیە.

## ١٦ هەڵگری قورئان تاجی زێڕینی پێشکەش دەکرێ



١٦- عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَجِيءُ الْقُرْآنُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ! حَلِّهِ فَيُلْبَسُ تَاجَ الْكَرَامَةِ، ثُمَّ يَقُولُ: يَا رَبِّ! زِدْهُ، فَيُلْبَسُ حُلَّةَ الْكَرَامَةِ، ثُمَّ يَقُولُ: يَا رَبِّ! ارْضَ عَنْهُ، فَيَرْضَى عَنْهُ، فَيُقَالُ لَهُ: اقْرَأْ وَارْقَ وَيُزَادُ بِكُلِّ آيَةٍ حَسَنَةً»[(١)].



واتە: ئەبو هوڕەیرە ﵁، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «لە ڕۆژی قیامەتدا قوڕئان دێ (لەگەڵ ئەو کەسەی خوێندوویەتی لە دونیا) دەفەرموێ: ئەی پەروەردگارم! بیـڕازێنەوەو خشڵی لەبەر بکە، جا تاجی ڕێزی لەسەر دەنرێ، پاشان دەفەرموێ: ئەی پەروەردگارم زیاتری پێبدە، جا پۆشاکی ڕێزی لەبەر دەکرێ و دەڕازێنرێتەوە، ئینجا قوڕئان دەفەرموێ: ئەی پەروەردگارم لێی ڕازیبە، خواش لێی ڕازی دەبێ، ئینجا بەو کەسە دەگوترێ: قوڕئان بخوێنەو سەربکەوە (بۆ پلەکانی بەهەشت) وە بە هەر ئایەتێک چاکەیەکی بۆ زیاد دەکرێ».

---

(١) أَخْرَجَهُ التِّرمِذيُّ: ٢٩١٥، وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، والحاكم: ٢٠٢٩، انظر: صَحِيح الْجَامِع: ٨٠٣٠، صَحِيح التَّرْغِيبِ وَالتَّرْهِيب: ١٤٢٥.



## ❀ مـانـای زمانەوانـی ❀

(حَلَّـهِ): واتە: بیرازێنەوە، (حِلْيَة): ناوە بۆ هەموو ئەو شتانەی لە زێڕو زیو دروست دەکرێن و خۆیاَن پێ دەڕازێنرێتەوە.

(الكَرَامَةِ): ناوێکە لە (إِكْرَام)ـەوە هاتووە، کە بریتیە لە بەخشینی شتانێکی گرانبەها بەوپەڕی پێ خۆشبوونەوە.

## ❀ پەیامە پەروەردەییەکان ❀

• گەورەیی و پیت و پێزو بەرەکەتی قورئان لە ڕۆژی دواییشدا ناپچڕێت.

• لە هەر ئایەتێک لە ئایەتەکاندا، گەورەیی قورئان بەدی دەکرێت.

• سوودو بەرەکەتی قورئان هۆکارێکە بۆ ڕەزامەندی خوای گەورەو پلە بەرزەکانی بەهەشت.

• بە ئەندازەی ئەوەی بەندە هەوڵ و کۆششی خۆی دەبەخشێ لە خزمەتی قورئاندا، ئەوەندە پاداشت و پێگەی دەست دەکەوێت.

## ❀ ڕێنماییە کردارییەکان ❀

• پەیوەندیت باش بکە لەگەڵ قورئاندا، قورئانیش چاک دەبێت لەگەڵت (لە ڕۆژی دوایی بەرگریت لێ دەکات و تکات بۆ دەکات).

• هاوڕێیەکی ئەمەکدارو وەفادارو ڕاستگۆبە لە مامەڵەو ڕەفتارت لەگەڵ قورئاندا.

• دڵت پەیوەست بکە بەو پیت و پێزو چاکانەی لە گشت سووڕەت و ئایەتەکانی قورئاندا هەن و، بەهرەیان لێ وەربگرە.

## ١٧ قورئان تاكە ڕاسپاردەی پێغەمبەری خوایە ﷺ



**١٧- عَنْ طَلْحَةَ بْنِ مُصَرِّفٍ، قَالَ: سَأَلْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى رضي الله عنهما: هَلْ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ أَوْصَى؟ فَقَالَ: «لاَ»، فَقُلْتُ: كَيْفَ كُتِبَ عَلَى النَّاسِ الوَصِيَّةُ - أَوْ أُمِرُوا بِالوَصِيَّةِ؟ - قَالَ: «أَوْصَى بِكِتَابِ اللَّهِ»[1].**

واتە: تەڵحەی کوڕی موصەڕڕیف دەڵێ: پرسیارم کرد لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا رضي الله عنهما: ئایا پێغەمبەر ﷺ وەسیەتی بە هیچ شتێک کردوە (بە بەخشینی ماڵ، یاخود دانانی کەسێک لە شوێنی خۆی وەک جێنشین، یان وەسیەتێکی دیکە..)؟ گوتی: «نەخێر»، گوتم: ئەدی چۆن لەسەر خەڵک پێویست کراوە وەسیەتیان هەبێت، - یاخود فەرمانیان پێکراوە ڕاسپاردەو وەسیەت بکەن؟ گوتی: «(پێغەمبەری خوا ﷺ) وەسیەتی کردو ڕایسپارد کە دەست بە قوڕئانەوە بگیرێت و کار بە نێوەڕۆکی بکرێت».

---

(١) أَخْرَجَهُ البُخَارِيّ: ٥٠٢٢.



## ❁ مانای زمانەوانی ❁

(أَوْصَى بِكِتَابِ اللَّهِ): واتە: کارکردن بەوەی لە قورئاندا هەیە.

## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

• گەورەیی قورئانی بەڕێز لەوە دەردەکەوێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ وەسیەتی پێکردوە بۆ ئۆممەتەکەی، وەسیەتیش بۆ شتێک دەکرێت کە گەورەو گرنگ و ڕێزدار بێت.

• دەستگرتن بە وەسیەتی پێغەمبەری خوا ﷺ کە بریتیە لە دەستگرتن و کارکردن بە قورئان، هۆکارە بۆ سەرکەوتن و سەرفرازی.

## ❁ ڕێنماییە کردارییەکان ❁

• سووربە لەسەر دەست گرتنت بە ڕاسپاردەی پێغەمبەر ﷺ کە بریتیە لە دەست گرتن بە کتێبی خواو کار پێکردنی.

• تۆش بەمە خەڵک ڕابسپێرە، کە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ تۆی پێ ڕاسپاردوە، (کە بریتیە لە دەستگرتن بە قورئان، بە خوێندن و تێگەیشتن و کارپێکردن و خەڵک فێر کردنی).

• سووربە لەسەر پرسیارکردن و فێربوونی زانست و هەر شتێکی دیکە کەوا سوودت پێ دەگەیەنێت.



١٨- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَجْمَعُ بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ مِنْ قَتْلَى أُحُدٍ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، ثُمَّ يَقُولُ: «أَيُّهُمْ أَكْثَرُ أَخْذًا لِلْقُرْآنِ ؟» فَإِذَا أُشِيرَ لَهُ إِلَى أَحَدِهِمَا قَدَّمَهُ فِي اللَّحْدِ، وَقَالَ: «أَنَا شَهِيدٌ عَلَى هَؤُلَاءِ يَوْمَ القِيَامَةِ»، وَأَمَرَ بِدَفْنِهِمْ بِدِمَائِهِمْ، وَلَمْ يُغَسَّلُوا وَلَمْ يُصَلَّ عَلَيْهِمْ[1].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵلا ﵄، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو پیاوی لە کوژراوانی ئوحودی پێکەوە کۆدەکردەوەو لەناو پۆشاکێک، (یان یەک گۆڕ) دەیناشتن، پاشان دەیفەرموو: «کامیان زیاتر بە قورئان شارەزاو زاناتر بوو ؟» کاتێک ئاماژەی بۆ کرا بە یەکێکیان، ئەوی پێشخست بۆ نێو لادڕەکە، فەرمووی: «من چاودێرو شایەدم بەسەر ئەوانەوەو لە ڕۆژی دوایی، وە فەرمانی کرد بە خوێنەوە بنێژرێن، جا نە شۆردران و نە نوێژی لەسەر کردن».

(١) أَخْرَجَهُ البُخَارِيّ: ١٣٤٣.



## ❁ مانای زمانەوانی ❁

(شَهِيدٌ): بە واتای ئامادەبوون و زانست و ڕاگەیاندن دێت.

(اللَّحْدُ): بە مانای لادانە لە ڕاست، بۆیە بە لادڕ دەگوترێ: (اللَّحْد)، چونکە (شێوازەکەی وایە): لادەدا بۆ یەکێک لە دوو لاکانی گۆڕ.

## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

- هەڵگرانی قوڕئان بە زیندوویی و بە مردوویی ڕێز لێگیراون و پێش دەخرێن.
- پێوەری بەراورد کردن لە نێوان خاوەن پلەو پێگەکان لە دونیاو دوارۆژدا بە ئەندازەی پەیوەستی و پابەندیانە بە قوڕئانەوە.

## ❁ ڕێنماییە کردارییەکان ❁

- دەستبگرە بە قوڕئانەوە، سووربە لەسەر هاوەڵایەتی کردنی، پێشدەخرێیت و ڕێز لێگیراو دەبیت.
- با پێوەرت بۆ بەراورد کردن لە نێوان خەڵک، بریتی بێ لە قوڕئان و، ئەندازەی دەست گرتنیان بە قوڕئانەوە.

## ١٩ لە بە مەزنگرتنی قورئان مامناوەندبوونی دەنگە لە کاتی خوێندنی

١٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدرِيِّ ﵁، قَالَ: اعْتَكَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي المَسْجِدِ، فَسَمِعَهُمْ يَجْهَرُونَ بِالْقِرَاءَةِ، فَكَشَفَ السِّتْرَ وَقَالَ: «أَلَا إِنَّ كُلَّكُمْ مُنَاجٍ رَبَّهُ، فَلَا يُؤْذِيَنَّ بَعْضُكُمْ بَعْضاً، وَلَا يَرْفَعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَعْضٍ فِي الْقِرَاءَةِ» أَوْ قَالَ: «فِي الصَّلَاةِ»[١].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﵁، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێو مزگەوت ئیعتیکافی کرد، بیستی (هاوەڵان) بە دەنگی بەرز قورئان دەخوێنن، پەردەکەی (نێوانماڵی و مزگەوتی) لاداو فەرمووی: «ئاگاداربن، وریابن، ئێوە هەمووتان خواپەرستی دەکەن و لە خوا دەپاڕێنەوە، با هەندێکتان هەندێکی دیکەتان ئەزیەت نەدات، وە هەندێکتان دەنگی بەسەر هەندێکتان بەرز نەکاتەوە لە کاتی قورئان خوێندندا» یان فەرمووی: «لە کاتی نوێژ کردندا».

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١١٩١٥، قَالَ شُعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صَحِيح عَلَى شرط الشيخين، وَأخرجه ابْنُ خُزَيْمَة: ١١٦٢، وَالحَاكِمُ: ١١٦٩، وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ.



## مـانـای زمانەوانـی

(اعْتَكَفَ): (عُكُوفُ): بریتیە لە ڕووتێکردن و دەرنەچوون، واتە: ڕووتێکردنت لە شتێک کە لێی دەرنەچی و وازی لێ نەهێنی.

(مُنَاجِ): وشەی (نَجْو) داپۆشین و شاردنەوەیە، (نَجْوَى)ش نهێنیە لە نێوانً دوو کەس.

## پەیامە پەروەردەییەکان

• لە بە گەورەگرتنی قورئان ئەوەیە: لە کاتی خوێندنیدا، ئەگەر چەند کەسێک بوون بەیەکەوە، دەنگیان بەسەر یەکتر بەرز نەکەنەوە.

• خوێندنەوەی قورئان گفتوگۆیە لەگەڵ خوای گەورە.

• لە خراپترین جۆری ئەزیەتدانی قورئانخوێن ئەوەیە: لە کاتی قووڵ بوونەوەیدا، لەقورئان دابېڕێنرێ، ئەگەر بەهۆی قورئان خوێندنی کەسێکی دیکەشەوە بێ، ئەی ئەگەر بە قسەی ئاسایی قورئانەکەی پێ بپچڕێنرێ؟

## ڕێنماییە کردارییەکان

• سووربە لەسەر ئەوەی کە مامناوەند بیت لە خوێندنەوەی قورئاندا، کە لە نێوان زۆر دەنگ بەرزی و بێدەنگیدا بێت، بۆ ڕەچاوکردنی کەسانی دەوروبەرت.

• وا هەست بکە لە کاتی خوێندنەوەی قورئاندا، ئەوە تۆ گفتوگۆ لەگەڵ پەروەردگارتدا دەکەی (دەتدوێنێ و فەرمایشتت بۆ دەفەرموێ!).

• وریـــابە لەوەی ئەزیەتی هیچ کەســێک بدەی بە هۆی قورئــان خوێندنەوەکەت.

٢٠- عَنْ بُرَيْدَةَ بْنِ الحَصيبِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَإِنَّ الْقُرْآنَ يَلْقَى صَاحِبَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حِينَ يَنْشَقُّ عَنْهُ قَبْرُهُ كَالرَّجُلِ الشَّاحِبِ، فَيَقُولُ لَهُ: هَلْ تَعْرِفُنِي؟ فَيَقُولُ: مَا أَعْرِفُكَ، فَيَقُولُ: أَنَا صَاحِبُكَ الْقُرْآنُ، الَّذِي أَظْمَأْتُكَ فِي الْهَوَاجِرِ، وَأَسْهَرْتُ لَيْلَكَ، وَإِنَّ كُلَّ تَاجِرٍ مِنْ وَرَاءِ تِجَارَتِهِ، وَإِنَّكَ الْيَوْمَ مِنْ وَرَاءِ كُلِّ تِجَارَةٍ، فَيُعْطَى الْمُلْكَ بِيَمِينِهِ، وَالْخُلْدَ بِشِمَالِهِ، وَيُوضَعُ عَلَى رَأْسِهِ تَاجُ الْوَقَارِ، وَيُكْسَى وَالِدَاهُ حُلَّتَيْنِ لَا يُقَوَّمُ لَهُمَا أَهْلُ الدُّنْيَا، فَيَقُولَانِ: بِمَ كُسِينَا هَذِهِ؟ فَيُقَالُ: بِأَخْذِ وَلَدِكُمَا الْقُرْآنَ، ثُمَّ يُقَالُ لَهُ: اقْرَأْ وَاصْعَدْ فِي دَرَجِ الْجَنَّةِ وَغُرَفِهَا، فَهُوَ فِي صُعُودٍ مَا دَامَ يَقْرَأُ، هَذًّا كَانَ أَوْ تَرْتِيلًا»[١].

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد ٢٣٠٠٠، قَالَ شُعَيْب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ حَسَن.

واتە: بورەیدەی کوڕی حەصیب ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە ڕۆژی دواییدا (پاداشتی) قورئان دەگات بە خاوەنەکەی کاتێ گۆڕەکەی بۆ لەت دەبێ و لێی دەردەچێ، لەسەر شێوەی پیاوێکی ماندووی ڕەنگ و جەستە گۆڕاو[1]، جا پێی دەڵێ: ئایا دەمناسیەوە؟ ئەویش دەڵێ: ناتناسم! دەڵێ: من هاوڕێکەتم ئەو قورئانەم کە لە قرچەی گەرمادا، تینووم دەکردی لە کاتی گەرمادا (بە هۆی ئەوەی دەتخوێندمەوە بە زمانی بەڕۆژووەوە)، وە شەونخونیم پێ دەکردی، جا بێگومان گشت بازرگانێک لە دواوەی بازرگانیەکەیەتی[2]، بە ڕاستی تۆ ئەمڕۆ لە پشت هەموو بازرگانییێکەوەی، سەروەت و سامانی دەدرێتە دەستی ڕاستی و، ژیانی هەمیشەیی دەدرێتە دەستی چەپی، تاجی شکۆو سەنگینی دەخرێتە سەری، باوک و دایکیشی دوو پۆشاکی سەرتاپایان لەبەر دەکرێ، ئەگەر ئەهلی دونیا هەرچیان هەیە خەرجی بکەن، تا ئەو دوو پۆشاکە بکڕن ناتوانن (ئەوەندە گرانبەهایە)، جا دەڵێن: بە هۆی چ شتێکەوە ئەم دوو پۆشاکەمان لەبەر کراوە؟ دەگوترێ: بە هۆی ئەوەی منداڵەکەتان فێری قورئان کردوە، پاشان پێی دەگوترێ: بخوێنەو بەرزبەوەو سەربکەوە بۆ پلە و پایەکانی بەهەشت و ژوورە بەرزەکانی، ئەو بەردەوام لە بەرزبوونەوە دایە، تا قورئان بخوێنێ بە خێرایی بێ، یان بە هێواشی و لەسەرخۆیی».

---

(١) واتە: وەکو چۆن خاوەنەکەی لە دونیادا بە زمانی بەڕۆژوو قورئانی خوێندوەو ماندوو بووە، قورئانیش لە ڕۆژی دواییدا بەو شێوە ماندوو دەبێ تا پێی دەگات و شەفاعەتی بۆ دەکات.

(٢) لە ڕۆژگاری کۆندا بازرگانەکان پێشی بازرگانیەکەیان دەکەوتن بۆ ئەوەی بیپارێزن، مانای ئەوەیە: قورئان پێشی خاوەنەکەی دەکەوێ تا بیپارێزێ.



## ❀ مـانـای زمانەوانـی ❀

(الشَّاحِبْ): بریتیە لە گۆڕانی ڕەنگ و ڕووخسار بە هۆی گەشتکردن، یان نەخۆشیەوە، (یان برسیەتی)، یان وێنەی ئەوانە.

(الهَوَاجِرْ): (هَاجَرة) نیوەی ڕۆژێیە، واتە: نیوەڕۆ، بۆیەش ناویان لێناوە (هاجرة)، چونکە لەو کاتەدا خەڵک لە ماڵەکانیان ئۆقرە دەگرن و دەمێننەوە، وەک ئەوەی کۆچیان کردبێت (کەس دیار نیە لە دەرەوە، لەبەر گەرما).

(هَـذّاً): (الهَذُّ): بریتیە لە پەلەکردن لە خوێندنەوەو پەلەکردن لە پچڕاندن.

## ❀ پەیامە پەروەردەییەکان ❀

• باشترین هاوەڵ قورئانە، خێرو بەرەکەتی ناپچڕێ و کۆتایی نایەت تا ڕۆژی قیامەت.

• بازرگانی ڕاست و دروست لەگەڵ قورئاندا بریتیە لە کارپێکردن و جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی و، نەشکاندنی قەدەغەکانی و، خوێندنی لە نوێژو شەونوێژدا.

• ئەو بڕوادارەی بە تەواوی دەست بە قورئانەوە دەگرێ بازرگانێکی براوەو قازانج دەستکەوتوە، ئاگاداربن! جوانی و ڕازاوەکانی دونیا فریوتان نەدات.

• پەروەردەکردنی منداڵەکان لەسەر قورئان بۆ دایک و باوک بەرەکەتێکی گەورەیەو، سوودێکی گشتی هەیە بۆ دونیا و دواڕۆژیان.







## ❋ ڕێنماییە کردارییەکان ❋

• سووربە لەسەر کارکردن بە قوڕئان، چونکە مامەڵەو بازرگانیەکی براوەیە.

• هاوەڵیەتی قوڕئان بکەو، کۆشش بکە لەسەر هاوەڵیەتی و لە دەست نەدانی، چونکە تەواوی سەرفرازی لەو هاوەڵیەتیەدایە.

• بە کەم سەیری کەسی هەژارو داماو مەکە، لەوانەیە هاوەڵی قوڕئان بێت و، خێرو بەرەکەت لەگەڵ ئەودا بێت.

• سووربە لەسەر پەروەردەکردنی منداڵەکانت لەسەر دەست گرتنیان بە قوڕئان، چونکە باشترین ڕێگە و شێوازی پەروەردەکردنیانە.

## قورئان نووری سەر زەوی و توێشووی ئاسمانە



٢١- عَنْ أَبِي ذَرٍّ رضي الله عنه، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَوْصِنِي، قَالَ: «عَلَيْكَ بِتَقْوَى اللَّهِ، فَإِنَّهُ رَأْسُ الأَمْرِ كُلِّهِ»، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! زِدْنِي، قَالَ: «عَلَيْكَ بِتِلاَوَةِ الْقُرْآنِ، فَإِنَّهُ نُورٌ لَكَ فِي الأَرْضِ، وَذُخْرٌ لَكَ فِي السَّمَاءِ»[(١)].

واتە: ئەبو زەڕ رضي الله عنه دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاریم بکە، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «پارێز بکە (لە سنوورەکانی) خوا، ئا ئەوە چڵەپۆپەو گەورەی هەموو کارە باشەکانە»، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! بۆم زیاد بکە (زیاترم پێبڵێ)، فەرمووی: «قورئان بخوێنەوە، چونکە نوورە بۆت لە زەویداو، توێشووە بۆت لە ئاسماندا».

(١) أَخْرَجَهُ إِبْنُ حِبَّان: ٣٦١، انظر: صَحِيح التَّرْغِيبِ وَالتَّرْهِيب: ٢٢٣٣ , ٢٨٦٩.



## مانای زمانەوانی

(تِلَاوَة): بریتیە لە بەدواداهاتن، دەگوترێ: (تَلَوْتُهُ)، کاتێک (کەسەکە، یان شتەکە) بە دوایدا دەڕوات، جا (تلاَوَة القُرْآن) لەوەوەیە، چونکە (قوڕئانخوێن) ئایەت لە دوای ئایەت شوێنی دەکەوێت و دەیخوێنێتەوە.

(ذُخْرٌ): ئەو شتەیە کە هەڵدەگیرێ و دەپارێزرێ بۆ کاتی پێویست.

## پەیامە پەروەردەییەکان

• خوێندنەوەی قوڕئان ڕووناکیەو، بەندە کاروبارە ڕاست و دروستەکانی پێ دەبینێ.

• خوێندنەوەت بۆ قوڕئان وەبەرهێنانی توێشووی دواڕۆژتە (ئەم بەرهەمە زیاتر بکە).

• لە دیارترین نیشانەکانی هاتنەدی تەقوا، خوێندنەوەی قوڕئانە.

## ڕێنماییە کردارییەکان

• سووربە لەسەر داوای ئامۆژگاری کردن لە کەسانی خاوەن زانست و زانیاری بۆ گەیشتن بە پلەی تەقواو پارێزکاری.

• چرایەکی ڕۆشن بۆ خۆت هەڵبکەو دەستەبەری بکە لە ژیانتدا، بە هۆی خوێندنەوەی قوڕئانەوە.

• توێشوویەک لە چاکەکاری بۆ دواڕۆژی خۆت هەڵبگرە، بە هۆی قوڕئان خوێندنەوە.

## ٢٢ بنچینەی بە مەزنگرتنی قورئـان، ئیخلاص و خـوا مەبەست بوونە

٢٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ أَوَّلَ النَّاسِ يُقْضَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَيْهِ «وَذَكَرَ الشَّهِيد» ثُمَّ قَالَ: وَرَجُلٌ تَعَلَّمَ الْعِلْمَ، وَعَلَّمَهُ، وَقَرَأَ الْقُرْآنَ، فَأُتِيَ بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا، قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا؟ قَالَ: تَعَلَّمْتُ الْعِلْمَ، وَعَلَّمْتُهُ، وَقَرَأْتُ فِيكَ الْقُرْآنَ، قَالَ: كَذَبْتَ، وَلَكِنَّكَ تَعَلَّمْتَ الْعِلْمَ لِيُقَالَ عَالِمٌ، وَقَرَأْتَ الْقُرْآنَ لِيُقَالَ هُوَ قَارِئٌ، فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ، فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ... ».

أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ١٩٠٥

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁، دەڵێ، بیستم پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «یەکەم کۆمەڵ لە ڕۆژی قیامەت دادوەری دەکرێ بەسەریدا (و دەبردرێ بۆ دۆزەخ، چونکە بۆ خوای نەبووە) «باسی شەهیدی کرد»، پاشان فەرمووی: پیاوێک فێری زانست بووەو، خەڵکیشی فێرکردوەو قورئانیشی خوێندوە، دەهێنرێ نیعمەتەکانی پێ دەناسێنرێ، ئەویش دانی پێدادەنێ، (خوا، یان فریشتە پێی) دەڵێ: کارت پێکردوون؟ دەڵێ: فێری زانست بووم و، خەڵکیشم فێر کرد، قورئانیشم خوێند، دەفەرموێ: درۆت کرد، بەڵکو فێری زانست بووی بۆ ئەوەی پێت بگوترێ: زانایە، وە قورئانت خوێند بۆ ئەوەی پێت بگوترێ: قورئان خوێنە، بێگومان (ئەوەشت پێ) گوترا، پاشان فەرمانی پێدەکرێ لەسەر ڕووخساری ڕادەکێشرێ و هەتا دەخرێتە نێو ئاگر...».



## ❁ مانای زمانەوانی ❁

(يُقْضَى): (قضاء): بریتیە لە دادوەریی و بڕیارو بەجێگەیاندن و لێبوونەوەو تەواوبوون لە کارێک.

(عَرَّفَهُ نِعَمَهُ): بۆی دەرخست و، ڕوونی کردەوەو، بیری هێنایەوە.

## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

• لە بە مەزن دانانی خوێنەری قورئان بۆ نیعمەت و چاکەی خوا لەسەری کارکردنیەتی بە قورئان.

• بەڕێزترین و گەورەترین کارو کردەوە وەرناگیرێ ئەگەر دڵسۆزی و، خوا پێ مەبەست بوونی لەگەڵدا نەبێت.

• خوێنەری قورئان دەبێ زۆر سوور بێ لەسەر ئەوەی دڵی پەیوەست بێ بە پەروەردگاری (بەدڵسۆزیەوە ئەم قورئانە بخوێنێ و کاری پێبکات).

• ڕۆژی دوایی نهێنیەکان ئاشکرا دەکرێن، وە ڕاستیەکان بەدەردەخرێن، هیچ شتێک نامێنێتەوە بۆ بەندە، جگە لەوەی بۆ خوا ئەنجامی داوە بە دڵسۆزی.

## ❁ ڕێنماییە کردارییەکان ❁

• نابێ هەوڵی خوێنەری قورئان بۆ بەدەستهێنانی ناوبانگ و گەیشتن بە پێگەی دونیایی بێ، چونکە بێگومان ئەمانە هیچ نرخێکیان نیە.

• با خوێنەری قورئان وریابێ لە ڕووپامایی و ڕیابازی، چونکە نەخۆشیەکی شاراوەیەو، هەڵوەشێنەرەوەی کردەوەی چاکە.

## ٢٣ دەنگخۆش کردن بە قورئان لە تەواوی بە گەورە گرتنیەتی



٢٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّهُ، سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا أَذِنَ اللَّهُ لِشَيْءٍ، مَا أَذِنَ لِنَبِيٍّ حَسَنِ الصَّوْتِ، يَتَغَنَّى بِالْقُرْآنِ، يَجْهَرُ بِهِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: گوێی لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «خوای پەروەردگار گوێبیستی بۆ هیچ شتێک نەکردوە وەکو گوێبیستی بۆ پێغەمبەرێکی دەنگ خۆش، کاتێ قورئان بە ناسکی و ملکەچیەوە دەخوێنێ بەدەنگی بەرز».

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٩٨٠٤، والبُخَارِيّ: ٧٠٤٤، ومُسْلِم: ٧٩٢، وَأَبُو دَاوُدَ: ١٤٧٣.



## ❁ مانای زمانەوانی ❁

(أَذِنَ): واتە: گوێی بۆ گرت، یانی: خوا گوێی بۆ هیچ شتێک نەگرتوەو وەک گوێگرتنی بۆ پێغەمبەرێک کاتێک قورئان بە دەنگی خۆش دەخوێنێ، واتە: دەیخوێنێ و دەنگی پێ هەڵدێنێ.

(يَتَغَنَّى): واتە: جوان خوێندنەوەو ناسک کردنەوەی، جا هەر کەسێک دەنگی بەرز بکاتەوەو بە دوای یەکدا بیهێنێ، ئەوە لەلای عەرەب دەنگەکەی (غِنَاء)ـە.

## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

**• دەنگخۆشی چاکەو فەزڵی خوایە، جوانترین شێوەی سوپاسکردنی ئەم نیعمەت و چاکەیە، بریتیە لە جوان خوێندنەوەی قورئان بەم دەنگە.**

**• دەنگخۆش کردن بە قورئان، کارێکە خوا خۆشی دەوێ و، ئەم دەنگە خوا گوێی بۆ دەگرێ و دەیبیستێ (و بە پاداشتی چاک قبووڵی دەکات).**

**• بەرزکردنەوەی دەنگ لە کاتی قورئان خوێندنەوە بۆ خاوەنی دەنگی خۆش سوننەتە، بەبێ ئەوەی ئەزیەت بەدەوروبەری بگەیەنێ (واتە: لە کاتی خوێندنەوەیدا).**

## ❁ ڕێنماییە کردارییەکان ❁

• دەنگت بە قورئان بڕازێنەوە.

• هەست بەوە بکە کە خوای پەروەردگار گوێی لێتە لە کاتێکدا دەنگت خۆش دەکەیت بە خوێندنی قورئان!

## خۆ سەرقاڵ کردن بە قورئان جێگرەوەی هەموو شتێکە



٢٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدرِيِّ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَقُولُ الرَّبُّ ﷻ: «مَنْ شَغَلَهُ الْقُرْآنُ عَنْ ذِكْرِي وَمَسْأَلَتِي، أَعْطَيْتُهُ أَفْضَلَ مَا أُعْطِي السَّائِلِينَ، وَفَضْلُ كَلَامِ اللَّهِ عَلَى سَائِرِ الكَلَامِ كَفَضْلِ اللَّهِ عَلَى خَلْقِهِ»(١).

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﵁، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوا ﷻ دەفەرموێ: «هەر کەس سەرقاڵی بە قورئانەوە وای لێبکات نەپرژێتە سەر یادکردنم و پاڕانەوەو داوای پێداویستی کردن لێم، ئەوە زۆر لەوە باشتری پێ دەبەخەشم کە داواکاران داوام لێدەکەن، وە پلەو پێگەی فەرمایشتی خوا لەسەر هەموو قسەکانی دیکەی دروستکراوان، وەک گەورەیی خوایە بەسەر دروستکراوەکانیدا».

---

(١) أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ: ٢٩٢٦، وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وقال الحافظ في الفتح ج٩، ص ٦٦ رجاله ثقات إلا عطية العوفي ففيه ضعف، وضعَّفه الألباني.



## ❁ مانای زمانەوانی ❁

(شَغَلَهُ): (الشغل): واتە: سەرقاڵی، کە پێچەوانەی بێ کاری و دەست بەتاڵییە.

(مَسْأَلَتِي): (مَسْأَلَةُ) داواکردنە.

## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

• سەرقاڵ بوون بە خوێندنەوەی قورئان و تێرامان و تێفکرین لێی، لە گەورەترین و باشترینی کردەوەکانە.

• هەر کەسێک دەیەوێ پێداویستیەکانی بۆ جێبەجێ ببن، با قورئان بخوێنێتەوە.

• ئامادەبوونی گەورەیی وتەی خواو گەورەیی خاوەنی وتەکە لە دڵی خوێنەری قورئان، تام و چێژی پەرستش و هەستکردن بە هەژاری بەندە لەلای خوای گەورە بۆ دەستەبەر دەکات.

## ❁ ڕێنماییە کرداریی‌ەکان ❁

• خۆت سەرقاڵ بکە بە خوێندنەوەی قورئان، چونکە باشترین فەرمایشتە.

• دڵت ئامادە بکە لە کاتی گوێگرتن و بیستنت بۆ قورئان خوێندنەوە (جا خۆت بیخوێنیەوە، یان بۆت بخوێنرێتەوە).

## ٢٥ ئایەتێکی قورئان باشترە لە خۆشیەکانی دونیا



٢٥- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﵁، قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَنَحْنُ فِي الصُّفَّةِ، فَقَالَ: «أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنْ يَغْدُوَ كُلَّ يَوْمٍ إِلَى بُطْحَانَ، أَوْ إِلَى الْعَقِيقِ، فَيَأْتِيَ مِنْهُ بِنَاقَتَيْنِ كَوْمَاوَيْنِ فِي غَيْرِ إِثْمٍ، وَلاَ قَطْعِ رَحِمٍ ؟» فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ نُحِبُّ ذَلِكَ، قَالَ: «أَفَلاَ يَغْدُو أَحَدُكُمْ إِلَى الْمَسْجِدِ فَيَعْلَمَ، أَوْ يَقْرَأَ آيَتَيْنِ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ ﷿، خَيْرٌ لَهُ مِنْ نَاقَتَيْنِ، وَثَلاَثٌ خَيْرٌ لَهُ مِنْ ثَلاَثٍ، وَأَرْبَعٌ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَرْبَعٍ، وَمِنْ أَعْدَادِهِنَّ مِنَ الإِبِلِ»[١].

واتە: عوقبەی کوڕی عامیر ﵁، دەڵێ: ئێمە لە صوففە بووین[٢]، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەر بۆ لامان، فەرمووی: «کامتان پێی خۆشە هەموو ڕۆژێک بچێت بۆ دۆڵ و شیوی بوتـحان، یان بچێت بۆ شیوی عەقیق، وە لەوێ دوو حوشتری مێینەی کۆپار قەڵەو بێنێتەوە، بەبێ تووشبوونی گوناهو پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی ؟» گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەموومان حەز دەکەین و پێمان خۆشە، فەرمووی: «ئەی بۆ هەموو ڕۆژێک یەکێک لە ئێوە ناچێ بۆ مزگەوت تا دوو ئایەت فێرببێ، یان دوو ئایەت بخوێنێ لە کتێبی خوا ﷿، ئەوە بۆی لە دوو حوشتر باشترە، وە سێ ئایەت لە سێ حوشتر باشترە بۆی، وە چوار ئایەت لە چوار حوشتر باشترە بۆی، وشتر بە پێی ژمارەکان»!!

(١) أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ١٩٠٩.
(٢) شوێنێک بوو لە مزگەوت، خەڵکە هەژارو داماوەکانی لێبوون.



## ❁ مانای زمانەوانی ❁

(يَغْدُوَ): بە مانای کات دێت، کە بریتیە لە ڕۆیشتن لە سەرەتای ڕۆژدا.

(بُطْحَانَ): ناوی دۆڵێکە لە شاری مەدینە.

(العَقِيق): دۆڵێکە لە نزیک (ذَات عِرْق).

(كَوْمَاوَيْن): کۆی (كَوْمَا)یە، کە بریتیە لەو حوشترەی کۆپارەکەی پشتی درێژو گەورەیە.

## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

• فێربوون و تێگەیشتن لە قوڕئان، باشترە لە هەموو خۆشیەکانی دونیا.

• فێربوونی قوڕئان و خوێندنەوەکەی بە کەم مەزانە، ئەگەر چەند ئایەتێکیش بێت.

• بەکارهێنانی شێوازی هاندان و ئارەزوودانەبەر بۆ لە خزمەت دابوونی قوڕئان لە ڕێبازو سوننەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

• دەستکەوتی حەقیقی بۆ هاتنەدی پاداشت ئەوەیە مرۆڤ لەکاتی ئەنجامدانی کارە چاکەکە تووشی گوناهێک نەبێت.

## ❁ ڕێنماییە کرداریيەکان ❁

• سووربە لەسەر فێربوونی قوڕئان ئەگەر چەند ئایەتێکیش بێت.

• داهێنان و گۆڕانکاری بکە لە هاندان و ئارەزوودانەبەر بۆ فێربوونی قوڕئان و خەڵک فێر کردنی.



## ٢٦ به گەورەگرتنی قورئان بە کارپێکردنیەتی



٢٦- عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ ﵁، قَال: قَال رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلِ الأُتْرُجَّةِ، رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا طَيِّبٌ، وَمَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلِ التَّمْرَةِ، لَا رِيحَ لَهَا، وَطَعْمُهَا حُلْوٌ، وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلُ الرَّيْحَانَةِ، رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ، وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الحَنْظَلَةِ، لَيْسَ لَهَا رِيحٌ، وَطَعْمُهَا مُرٌّ»[1].

واتە: ئەبو مووسای ئەشعەریی ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «نموونەی ئەو بڕوادارەی کە قورئان دەخوێنێ، وەکو لیمۆ وایە، بۆنی خۆشەو تامیشی خۆشە، وە نموونەی ئەو بڕوادارەی کە قورئان ناخوێنێ، وەکو خورما وایە، بۆنی نیەو تامی شیرینە، وە نموونەی ئەو دووڕووەی کە قورئان دەخوێنێ وەکو ڕەیحانە وایە بۆنی خۆشە و تامی تاڵە، وە نموونەی ئەو دووڕووەی کە قورئان ناخوێنێ، وەکو گوژاڵک وایە هیچ بۆنی نیەو تامیشی تاڵە».

(١) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٥٤٢٧، ومُسْلِم: ٧٩٧.



## ❁ مانای زمانەوانی ❁

(**الرَّيْحَانَة**): ڕووەکێکی ناسراوە، بۆنداری گیاییە، بۆنی خۆشەو تامی تاڵە.

(**الحَنْظَلَة**): ڕووەکێکی وەرزیە، لە توخمی کولەکە (کودی)یە، هیچ بۆنێکی نیە، بەرەکەی و گەڵاکانی زۆر تاڵە.

## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

• ئەو کەسەی هەڵگری قوڕئانەو کاری پێدەکات، کەسێکی پاک و چاکە لە هەموو ڕووێکەوە.

• قوڕئان بەرەکەت و پیرۆز چاکەیە لە هەموو ڕووێکەوە.

• تەواوی بە گەورەگرتنی قوڕئان لە خوێندنەوەو کار پێکردنیەتی.

• گەورەیی قوڕئان و بەرەکەتەکەی لە هەموو کات و سات و ڕووێکەوە دەگات بەو کەسەی دەستی پێوە گرتوە.

## ❁ ڕێنماییە کرداریەکان ❁

• وەکو لیمۆ بە، کە دەرەوەو ناوەوەی پاکە، بە هۆی دەستگرتنت بە قوڕئانەوە، بە خوێندنەوەو کارپێکردنی.

• وریابە نەبیە گوژاڵک کە دەرەوەو ناوەوەی خراپە، بە هۆی وازهێنان و پشت هەڵکردنت لە قوڕئان.

• وێنەو نموونە بە کاربێنە لە کاتی باسکردنی قوڕئان بۆ خەڵک، بۆ نزیک کردنەوەو تێگەیاندنی ماناو مەبەستەکانی قوڕئان بۆ کەسی بەرانبەر.




٢٧- عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا حَسَدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الْقُرْآنَ، فَهُوَ يَتْلُوهُ آنَاءَ اللَّيْلِ، وَآنَاءَ النَّهَارِ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا، فَهُوَ يُنْفِقُهُ آنَاءَ اللَّيْلِ، وَآنَاءَ النَّهَارِ»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئێرەیی دروست نیە جگە لە دوو شتدا نەبێ: پیاوێک خوا قورئانی پێداوە (فێری قورئان خوێندن بووە)، لەکاتی شەوداو، لەکاتی ڕۆژدا دەیخوێنێ، وە پیاوێکیش خوا ماڵ و سامانی پێداوەو ئەویش لەکاتی شەو و، لەکاتی ڕۆژدا دەیبەخشێ (لە پێناوی خوا)».

(١) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٧٥٢٩، ومُسْلِم: ٨١٥.



## مـانـای زمانەوانـی

(حَسَدَ): حەسوودی ئەوەیە کە کەسێک نیعمەتێک بەسەر کەسێکی دیکەوە دەبینێ خۆزگە بخوازێ ئەو نیعمەتە لەو لابچێ و بۆ ئەو بێت، (غِبْطَة)ـش: بریتیە لە حەسوودیەکی چاک، کە ئەوەیان مەبەستی فەرموودەکەیە، کە بریتیە لەوەی: خۆزگە بخوازێت ئەویش هەمان شتی کەسەکەی هەبێت و خۆزگە ناخوازێت بۆ ئەو نەمێنێت.

(آنَـاءْ): کاتێکە لە کاتەکانی شەو یان ڕۆژ.

## پەیامە پەروەردەییەکان

• قوڕئان خەڵاتێکی خوایە، پلەیەکی زۆر گەورەیە، هەر کەسێکی بوێ پێی دەبەخشێ و، ئەم خەڵاتە تایبەت دەکات بەو.

• سوپاس کردنی خوا لەبەرانبەر پێدانی نیعمەتی قوڕئان ئەوەیە: لە شەو و ڕۆژدا بخوێنرێتەوە.

• لە بەرانبەر نیعمەتدا واجب ئەوەیە: نیعمەتەکە ببەخشیەوەو کاری پێ بکەی لە ڕەزامەندی خوادا.

## ڕێنماییە کردارییەکان

• سووربە لەسەر خوێندنی قوڕئان لە (بەشێکی) شەو و ڕۆژدا.

• داوای فەزڵ و چاکەو بەزەیی فراوانی پەروەردگار لە خوا بکە، چونکە خوا زاتێکی بەڕێزو بەخشندەیە (بێ ئەندازە دەبەخشێ بەوانەی داوای لێدەکەن).

## ٢٨ ئەو کەسەی قوڕئانی زیاتری لەبەرە شایستەترە بۆ پێشنوێژی کردن



٢٨- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَؤُمُّ الْقَوْمَ أَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللَّهِ، فَإِنْ كَانُوا فِي الْقِرَاءَةِ سَوَاءً، فَأَعْلَمُهُمْ بِالسُّنَّةِ، فَإِنْ كَانُوا فِي السُّنَّةِ سَوَاءً فَأَقْدَمُهُمْ هِجْرَةً، فَإِنْ كَانُوا فِي الْهِجْرَةِ سَوَاءً، فَأَقْدَمُهُمْ سِلْمًا، وَلاَ يَؤُمَّنَّ الرَّجُلُ الرَّجُلَ فِي سُلْطَانِهِ، وَلاَ يَقْعُدْ فِي بَيْتِهِ، عَلَى تَكْرِمَتِهِ إِلَّا بِإِذْنِهِ»[1].

واتە: ئەبو مەسعوودی ئەنصاریی ﵁، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «با شارەزاترین کەس بە کتێبی خوا پێشنوێژی بۆ خەڵک بکات، ئەگەر (خەڵکەکە) لە خوێندنی (و شارەزایی بە) قوڕئاندا وەک یەکتری بوون، ئەو کەسەیان پێش دەخرێ کە شارەزاترینیانە بە سوننەت، جا ئەگەر لە (شارەزایی) لە سوننەتیشدا وەک یەک بوون، ئەو کەسەیان پێش دەخرێ کە زووتر کۆچ (هِجْرَة)ی کردوە، جا ئەگەر لە کۆچکردنیشدا وەکو یەکتر بوون، ئەو کەسەیان پێش دەخرێ کە زووتر مسوڵمان بووە، وە با هیچ کەس پێش کەسێکی دیکە نەکەوێ و ئیمامەتی بۆ نەکات لە شوێنی دەسەڵات و فەرمانڕەوایەتیەکەی (وەك: ماڵ و فەرمانگە و مزگەوت و... هتد)، وە لەسەر شوێنی دانیشتنی تایبەتی خۆیشی دامەنیشە لە ماڵەکەیدا، تەنها بە مۆڵەتی ئەو نەبێت».

---

(١) أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٦٧٣، وأَحْمَد: ١٧١٠٤، وَأَبُو دَاوُدَ: ٥٨٢، وَالتِّرمِذِي: ٢٣٥.



## ❁ مانای زمانەوانی ❁

(یَؤُمُّ): پێش نوێژی بکات بە ئیمام بۆ ئەو کەسانەی ئامادە دەبن.

(سُلْطَانِه): شوێنی دەسترۆیشتویی و فەرمانڕەواییەکەی.

(تَكْرِمَتِهِ): شوێنی تایبەت بۆ دانیشتنی کەسێکە لە جێگە و یاتاغ و ئەوەی ئامادە دەکرێت بۆ ڕێزلێنانی.

## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

• هەڵگرو کارپێکەری قورئان پێش دەخرێ بەسەر ئەوانیترداو، لە پێشترو شایستەترە بە پێشنوێژی کردن بۆ خەڵک.

• کاربەجێیی ئەوە دەخوازێ کە ڕوونکردنەوە بدرێ دەربارەی کارە گەورەو گرنگەکان.

• پلەبەندی و دانانی بەدیل بۆ لابردنی ڕاجیایی و ناڕوونی تایبەتمەندیەکی بنچینەیی بەرنامەی بنچینەیی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

## ❁ ڕێنماییە کردارییەکان ❁

• کۆشش بکە بۆ لەبەرکردنی قورئان و بەدەرخستنی، بە هۆی ئەم کارەتەوە پێش دەخرێی (لە دونیاو دوارۆژدا).

• کاروبارە گرنگەکان بەڕوون و ئاشکرایی بۆ دەوروبەرت باس بکە (زۆر ئاساییە، با بزانن قورئانت چەند لەبەرە، چونکە هاندانە بۆ ئەوانیش).

• بە دیل دابنێ بۆ کاروبارە گشتیەکان، وە با پلەبەندی هەبێ بەوەی لەگەڵ حاڵی خەڵکیدا دەگونجێ.

## ٢٩ گەورەیی کۆبوونەوە، بۆ خوێندنەوەی قورئان



٢٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللَّهِ، يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ، وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ، إِلاَّ نَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَحَفَّتْهُمُ الْمَلاَئِكَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هیچ کۆمەڵێک نیە دابنیشن لە ماڵێک لە ماڵەکانی خوا قورئان بخوێنن و، یەکدی فێر بکەن، ئەوە مسۆگەر سەکینەت و ئارامیان بەسەردا دێتە خوار، وە خوا بە بەزەیی خۆی دایاندەپۆشێ و، فریشتەکان چواردەوریان دەدەن، وە باسیشیان دەکات لە لای ئەوانەی لای خۆین (واتە: لە لای فریشتەکان)».

---

(١) أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٢٦٩٩.



## ❁ مانای زمانەوانی ❁

(يَتَدَارِسُونَهُ): واتە: دەیخوێننەوەو دەوری دەکەنەوەو دەستی پێوە دەگرن، بۆ ئەوەی لە بیریان نەچێتەوە.

(السَّكِيْنَةُ): ملکەچی و زەلیلیە، کە پێچەوانەی هەڵبەز ودابەزو جووڵەیە.

(غَشِيَتْهُمُ): لە سەروویانەوە دایاندەپۆشێ، (تَغْشِيَة) داپۆشینی شتێکە بە شتێک.

(حَفَّتْهُمُ): وشەی (حَفَّ) دەورەدانە، یانی: فریشتەکان لە دەوریان دەسوورێنەوەو چوار دەوریان دەدەن.

## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

• کۆبوونەوە لەسەر قورئان بۆ فێربوون و، خوێندن و، خەڵک فێر کردن، هۆکارێکە بۆ دابەزینی ئارامیی و بەزەیی پەروەردگار.

• مزگەوتەکان ماڵی خواو باخچەکانی قورئانن.

• لە گەورەیی قورئان و، پلەو پێگەی ئەوەیە: لە کاتی خوێندنەوەو دەرس لەسەر گوتنەوەیدا، ئارامیی دادەبەزێ و فریشتەکان ئامادەی دەبن.

## ❁ ڕێنماییە کردارییەکان ❁

• سووربە لەسەر ئامادەبوونت لە کۆڕو دانیشتنەکانی خوێندنەوەی قورئان و، فێربوونی لە ماڵەکانی خوا (مزگەوت).

• فێری قورئان بە لەڕێگەی جوان خوێندنەوەو یەکدی فێرکردنەوە (لەلایەن مامۆستای تایبەت و شارەزا).





٣٠- عَنْ سَعْدِ بْنِ هِشَامِ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: أَتَيْتُ عَائِشَةَ ﵂، فَقُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ أَخْبِرِينِي بِخُلُقِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَتْ: كَانَ خُلُقُهُ الْقُرْآنَ[١].

واتە: سەعدی کوڕی هیشامی کوڕی عامیر دەڵێ: هاتمە خزمەت (دایکمان) عائیشە ﵂، گوتم: ئەی دایکی بڕواداران هەواڵم بدەرێ دەربارەی ڕەوشت و ڕەفتاری پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: ڕەوشت و ڕەفتاری قورئان بوو (واتە: قورئانێکی بەرجەستەکراو بوو).

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٢٤٦٠١.



## ❁ مانای زمانەوانی ❁

(**خُلُقُهُ**): (خُلُق) یانی: هەڵسوکەوت و ڕەفتارو سروشتی مرۆڤ، کە بریتیە لە حاڵەتێکی داچەقیوی ناخ لەوەوە کردارەکان دەردەچن و ئەنجام دەدرێن.

## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

• لە گەورەیی قورئان ئەوەیە: کە بەرنامەی ڕەوشتەو، ڕەوشتیش سەرچاوەی هەموو کارە باشەکانە لە ئایینی ئیسلامدا.

• پێغەمبەر ﷺ ڕێنشاندەرێکی کرداریە بۆ بەرنامەی ڕەوشت لە ئیسلامدا.

• قورئان پێوەری ڕەوشت و ڕەفتارە جوانەکانە لە نێو خەڵکدا، بە هۆی قورئانەوە چاک و خراپ دەناسرێنەوە.

## ❁ ڕێنماییە کردارییەکان ❁

• خۆت بەڕەوشتەکانی قورئان بڕازێنەوەو، بیکە بەمەشخەڵی خۆت لە ژیاندا.

• قورئان وەربگرە بەوەی کتێبێکی هەڵسوکەوتی و کرداریە (تەنها بۆ خوێندنەوەی سەرزارەکی نیە).

## ٣١ قورئان بەڵگەیە بۆت، یان بەڵگەیە لەسەرت



٣١- عَنْ أَبِي مَالِكٍ الأَشْعَرِيِّ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهُ ﷺ: «الطُّهُورُ شَطْرُ الإِيمَانِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلأُ الْمِيزَانَ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلآنِ (أَوْ تَمْلأُ) مَا بَيْنَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ، وَالصَّلاَةُ نُورٌ، وَالصَّدَقَةُ بُرْهَانٌ، وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ، وَالْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَكَ أَوْ عَلَيْكَ، كُلُّ النَّاسِ يَغْدُو، فَبَايِعٌ نَفْسَهُ، فَمُعْتِقُهَا أَوْ مُوبِقُهَا»[1].

واتە: ئەبو مالیکی ئەشعەریی ﵁، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پاک و خاوێنی نیوەی نوێژە (ئیمان لێرە بە مانای نوێژ دێ)، (الحمد لله) تەرازوو پڕ دەکات، (سبحان الله والحمد الله) نێوانی ئاسمانەکان و زەوی پڕ دەکەن، وە نوێژ نوورە، وە صەدەقەو خێرکردن بەڵگەیە (بۆ ڕاستی ئیمان)، هەروەها ئارامگرتن ڕووناکییە و، قورئانیش بەڵگەیە بۆت یان بەڵگەیە لەسەرت، هەموو خەڵکی کە ڕۆژ دەکەنەوە خۆیان دەفرۆشن، هەیانە خۆی ئازاد دەکات (بە گوێڕایەڵی خوا)، هەشیانە خۆی لە ناودەبات (بە سەرپێچی خوا)».

---

(١) أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٢٢٣.



## مـانـای زمانەوانـی

(شَطْرُ): نیوەی شتێکە.

(حُجَّةٌ): (حَج) یانی: مەبەست، (حُجَّة) (کە بۆ بەڵگە بەکاردێت) لەوەوە وەرگیراوە، چونکە بە مەبەست دەگیرێت، یان بە هۆی حەجەوە هەقی داواکراو بە مەبەست دەگیرێت.

(فَمُعْتِقُهَا): ئازادکەریەتی (ئازادی دەکات و ڕزگاری دەکات).

(مُوبِقُهَا): لە ناوی بردوە، لەناوبەریەتی

## پەیامە پەروەردەییەکان

• لە گەورەیی قورئان ئەوەیە شایەدێکی ڕاستگۆیەو، دادوەرێکی دادگەرە لەسەر هەموو خەڵک بە یەکسانی وەک یەک.

• ژیان گۆڕەپانی بردنەوەو، دۆڕاندنەو، قورئانیش پێوەرەکەیەتی.

## ڕێنماییە کردارییەکان

• پێش دەستکردنت بە خوێندنەوەی قورئان، دڵ و دەروون و لاشەت پاک بکەرەوە، تا خێرو بەرەکەتەکەی بە تەواوی بەدەست بهێنی.

• سووربە لەسەر کردەوە هەرە باشەکان، دەبیت بە ئەوانەی هەڵگری قورئانن (چونکە سەرلەبەری قورئان پێت دەفەرموێ: کردەوە باش و باڵاکان ئەنجام بدە).



# ٣٢ لە بەگەورەگرتنی قورئان دەنگخۆش کردنە بە خوێندنی



٣٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَتَغَنَّ بِالقُرْآنِ».

أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٧٥٢٧.



واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «لە (سەر ڕێبازو شێوەی خوێندنەوەی) ئێمە نیە (لەو بابەتەدا)، ئەو کەسەی دەنگی ناسک و خۆش نەکات و گرنگی پێ نەدات[١]، لە کاتی خوێندنەوەی قورئان».

## ❁ مانای زمانەوانی ❁

(لَيْسَ مِنَّا): دەستی بە سوننەتی ئێمەوە نەگرتووەو شوێن پێی ئێمەی هەڵنەگرتوە.

(يَتَغَنَّ): وشەی (يَتَغَنَّى) یانی: جوان خوێندنەوەو ناسک کردنەوەی، وە دەشگوترێ ماناکەی ئەوەیە: (لەسەر ڕێبازی ئێمە نیە) ئەوەی بێنیاز نەبوو بێ بەهۆی قورئان، لە جگە لە قورئان.

(١) قال الشافعي: معناه تَحْزِينُ القراءة وترقيقها. انظر: المُعْلم بفوائد مُسْلِم، المؤلف: أبو عبد اللَّهِ محمد بن علي بن عمر التَّمِيمي المازري المالكي (المتوفى: ٥٣٦هـ)، ج١، ص٤٥٩.



## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

• لە ڕێبازی ئیسلام ئەوەیە قورئان بەناسکی و حوزنەوە بخوێندرێتەوە.

• مەبەست و ئامانج لە دەنگخۆش کردنیش بە قورئان دروست کردنی کاریگەریە لەسەر دڵ و دەروون.

• بێنیاز بوون لە دونیاو شتە ڕازاوەکانی نێو دونیا بە هۆی قورئانەوە، ڕێچکەی پیاوچاکان و ڕێبازی چاکترینی پێغەمبەرانە کە موحەممەدە ﷺ.

## ❁ ڕێنماییە کردارییەکان ❁

• دەنگت خۆش بکە بە قورئان و، ملکەچی زیاتر بنوێنە لە کاتی خوێندنەوەی.

• چێژ ببەخشە بە دڵت بە سەیرکردن و، تێڕامان و، بیرکردنەوە لە ئایەتەکانی قورئان.

• وریابە لە زۆر سەرقاڵ بوونیشت بە دەنگخۆشی، لەوەی بێئاگا بیت لە جوان خوێندنەوەو وشەکان وەکو خۆی.



٣٣- عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمَاهِرُ بِالْقُرْآنِ مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ، وَالَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَيَتَتَعْتَعُ فِيهِ، وَهُوَ عَلَيْهِ شَاقٌّ لَهُ أَجْرَانِ».

أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٧٩٨.

واتە: عائیشە رضي الله عنها، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کەسی کارامە (لە خوێندن و کارپێکردنی) قورئاندا، لەگەڵ فریشتە ڕێزدارە بەڕێزەکانی خوایە، وە ئەو کەسەی کە قورئان دەخوێنێ و لەسەر زمانی تەواو نایێ (واتە: چاک نایزانێ) وە لەسەریشی قورسە، دوو پاداشتی بۆ هەیە».

## ❀ مـانـای زمانەوانـی ❀

(المَاهِرُ): واتە: کارامەو شارەزا لە خوێندنەوە.

(السَّفَرَة): واتە: فریشتە.

(يَتَتَعْتَعُ): واتە: هەڵە دەکات لە خوێندنەوەدا، وە دەگوترێ: (تَعْتَعَ الرَّجُلُ) ئەگەر زمانی تەنبەڵ بێت و تەتەڵە بکات لە کاتی قسە کردن.

(شَـاقٌّ): (مَشَقَّة): ناخۆشی و نارەحەتی، کە پێچەوانەی ئاسانی و بەختەوەرییە.



## پەیامە پەروەردەییەکان

• دەستگرتن بە قورئانەوە هەمووی خێر و چاکەیە.

• پێشبڕکێ و خۆماندووکردن بۆ فێربوونی قورئان (بە دەرخ کردن و خۆش خوێندنەوە) لە کارە ڕێگە پێدراوەکانە.

• ئەو کەسەی تووشی ناڕەحەتی و سەغڵەتی دەبێ بە هۆی فێربوونی قورئانەوە، پاداشتێکی مەزنی دەست دەکەوێ.

## ڕێنماییە کردارییەکان

• کۆشش بکەو، لە ئێستاوە هەوڵبدە تا لەگەڵ فریشتە ڕێزدارە چاکەکارەکان بیت، بە هۆی خۆکارامە کردن لە خوێندنەوەی قورئان.

• بێ ئومێد مەبەو، بێزار مەبە لە فێربوونی قورئان، چونکە قورئان هەر هەمووی خێرو چاکەیە.

• ئارام بگرە لەسەر فێرکردنی قورئان بۆ کەسێک کە لەلات دەخوێنێ و، لەسەری قورسەو بە زەحمەت فێر دەبێ.



## ٣٤ له بەگەورەگرتنی قورئانە بیخوێنی به نیازی پاداشتی دواڕۆژ



٣٤- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ، قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَاً وَنَحْنُ نَقْتَرِئُ، فَقَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ، كِتَابُ اللَّهِ وَاحِدٌ، وَفِيكُمُ الْأَحْمَرُ وَفِيكُمُ الْأَبْيَضُ وَفِيكُمُ الْأَسْوَدُ، اقْرَءُوهُ قَبْلَ أَنْ يَقْرَأَهُ أَقْوَامٌ يُقِيمُونَهُ كَمَا يُقَوَّمُ السَّهْمُ يُتَعَجَّلُ أَجْرُهُ وَلَا يُتَأَجَّلُهُ»[١].

واته: سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ، گوتوویەتی: ڕۆژێک پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنایە دەر بۆ لامان لە کاتێکدا قورئانمان دەخوێند، فەرمووی: «سوپاس بۆ خوا، کتێبی خوا تەنها یەکێکە، کەچی ئێوە سوورو سپی و ڕەشتان تێدایە[٢]، بیخوێننەوە پێش ئەوەی خەڵکانێک بیخوێننەوە کە وشەکان ڕاست دەکەنەوە وەک تیر ڕاست دەکرێتەوە (زۆر گرنگی دەدەن بە ڕاست دەربڕینی پیت و وشەکان) پاداشتەکەیان بۆ پێش دەخرێ (خەڵک مەدح و سەنایان دەکات) پاداشتەکەیان بۆ دواناخرێ بۆ ڕۆژی دوایی (چونکە بۆ خوا خۆیان فێر ناکەن، بۆ ڕیابازیانە)».

### ❁ مانای زمانەوانی ❁

(نَقْتَرِئُ): واتە: دەخوێنینەوە.

---

(١) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ: ٨٣١، انظر: «صحيح أبي داود»: ٧٨٤.

(٢) واتە: عەجەم و فارس و عەرەب و خەڵکی گەلانی دیکەتان تێدایە.

(يُقِيمُونَهُ): کۆشش دەکەن و زێدەڕۆیی دەکەن بۆ فێربوونی جوان خوێندنەوەی قورئان، لە چاککردنی بێژەکان و، ڕەچاوکردنی صیفات و یاساو ڕێساکانی جوان خوێندنەوەی قورئان.

(يَتَعَجَّلُ أَجْرَهُ): پاداشتی بە پەلە هەڵدەبژێرن کە بریتیە لە دونیا (بۆ ڕیا کاردەکەن).

(يَتَأَجَّلُهُ): (تَأَجُّلُ) لەسەر کێشی (تَفَعُّل)ـە، لە (أَجَل)ـەوە وەرگیراوە، کە بریتیە لە کاتێکی دیاریکراو لە داهاتوودا، واتە: داوای پاداشت ناکەن لە دوارۆژ.

## پەیامە پەروەردەییەکان

• کتێبی خوا گەورەترین ئامرازە بۆ کۆکردنەوەی ئۆممەتی ئیسلام، بە هەموو ڕەگەزو جیاوازی کۆمەڵ و گروپەکانیەوە.

• کتێبی خوا لە نێو ئۆممەتی ئیسلام گەورەترین چاکەو نیعمەتە کە شایان و شایستەی سوپاسکردن و ستایشکردنی خوایە.

• پێویستە لەسەر خوێنەری قورئان و، ئەو مامۆستایەش کە خەڵک فێر دەکات پێداچوونەوە بکات بە دڵسۆزیی و خوا پێ مەبەست بوونی خۆی، وە زۆر وریابێت لە پەلەپەلکردن بۆ وەرگرتنەوەی پاداشتەکەی (واتە: دەبێ چاوەڕوانی پاداشتەکەی بکات بۆ ڕۆژی دوایی، نەوەک بۆ ڕیایی و ڕووپامایی بێت).

## ڕێنماییە کردارییەکان

• سووربە لەسەر دڵسۆزیی و خوا پێ مەبەست بوون لە فێربوونی قورئان، زۆر وریابە لە ڕووپامایی و بەدەستهێنانی ناوبانگ.

• سوپاس و ستایشی خوا بکە لەسەر چاکەو نیعمەتی قورئان، لە هەردوو حاڵەتی فێرخوازی و مامۆستایەتیدا.

• وریابە لە داواکردنی دونیا بە هۆی قورئانەوە.

## ٣٥ ئامۆژگاری کردن بە پەیوەست بوون بە قورئان



٣٥- عَنْ أَبِي مُوسَى الأشعري رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «تَعَاهَدُوا هَذَا الْقُرْآنَ، فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَهُوَ أَشَدُّ تَفَلُّتاً مِنَ الإِبِلِ فِي عُقُلِهَا»[1].

واتە: ئەبو مووسای ئەشعەریی رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «پەیوەست بن بەم قورئانە (جار لە دوای جار بیخوێننەوەو دەوری بکەنەوەو بەردەوام بن)، سوێند بەو زاتەی نەفسی موحەممەدی بەدەستە، ئەو قورئانە بە خێراتر لەدەست دەردەچێت لە وشتر لە پەتەکەی ملی»[2].

ڕوونکردنەوە: مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوەیە ئەگەر زۆر پابەندنەبێ بە خوێندنەوەو پێداچوونەوەکردنی ئەوەی لەبەری کردووە بیری دەچێتەوە[3].

---

(١) أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٧٩١، والبُخَاري: ٥٠٣٣.

(٢) واتە: قورئان خێراتر دەڕوات لە سینگی بڕوادار لە وشتر لە پەتەکەی، کاتێ دەکرێتەوەو لەدەست دەردەچێ و جڵەو ناکرێ.

(٣) وەرگێڕ.





## ❁ مانای زمانەوانی ❁

(تَعَاهَدُوا): دەستی پێوەبگرن، دەگوترێ: (تَعَاهُدُ الشَّيء، وَتَعَهُّدُه) بریتیە لە دەستپێوەگرتن و نوێکردنەوەی پەیمان و نزیکی لێی، جا مەبەست پێی فەرمانکردنە بە بەردەوام بوون لەسەر خوێندنەوەی.

(تَفَلُّتاً): خۆ ڕزگارکردن و ڕۆیشتن و گۆڕان و لەدەست دەرچوونە.

(عُقُلِهَا): کۆی (عِقَال)ـە، کە پەت و گوریسێکە حوشتری پێ دەبەسترێتەوە.

## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

• قوڕئان زاڵە، دەبێ بڕوادار زۆر سوور بێ لەسەر تەواو پابەند بوون پێیەوە، بە جوان خوێندنەوەو کارپێکردنی.

• قوڕئان زۆر زوو لەبیر دەچێتەوە، کاتێک وازی لێ دەهێنی و جێی دەهێڵی.

## ❁ ڕێنماییە کردارییەکان ❁

• سووربە لەسەر زۆر دووبارەکردنەوەو پەیوەستبوون بەوەندە قوڕئانەی لەبەرت کردوە.

• چەندین شێواز و ئامڕازی پەیوەست بوون بە قوڕئان بەکاربهێنە: کە بریتین لە جوان خوێندنەوەو گوێگرتن و کارپێکردن و، تێفکرین و واتاکردن.





٣٦- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنْ أَحْسَنِ النَّاسِ صَوْتاً بِالْقُرْآنِ، الَّذِي إِذَا سَمِعْتُمُوهُ يَقْرَأُ، حَسِبْتُمُوهُ يَخْشَى اللَّهَ»[1].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی دەنگخۆشترین قورئانخوێن ئەو کەسەیە کە کاتێک گوێتان لێی بوو قورئان دەخوێنێ هەست بکەن کە لەخوا دەترسێ».

(١) أَخْرَجَهُ إِبْنُ مَاجَهْ: ١٣٣٩، والطبراني في الصغير: ٢٠٧٤. انظر: «صَحِيح الْجَامِع»: ٢٢٠٢، «صَحِيح التَّرْغِيبِ وَالتَّرْهِيب»: ١٤٥٠.



## ❁ مانای زمانەوانی ❁

(أَحْسَنْ): (اسم تَفْضِيل)ـە، وشەی (حُسْن) واتە: جوان، پێچەوانەی (قُبْح)ـە، واتە: ناشیرین.

(يَخْشَى): وشەی (خَشْيَة) بە مانای ترس و بیم دێت.

## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

• دەنگخۆش کردن و لاواندنەوە لە خوێندنی قورئان مەبەست و ئامانج نیە.

• مەبەست و ئامانج لە دەنگخۆشی، هاتنەدی ملکەچی و لە خوا ترسانە.

• باشترینی دەنگەکان کە قورئانی پێ دەخوێنرێتەوە ئەو دەنگەیە کە ترسی زیاتری خوای لەگەڵدا بێت.

## ❁ ڕێنماییە کردارییەکان ❁

• دەنگت خۆش بکە بە خوێندنەوەی قورئان بە ملکەچی و، ترس لەگەڵ بوون بۆ خوای پەروەردگار.

• پێداچوونەوە بە نیەت و مەبەستی دڵت بکە، لە کاتی گوێ گرتن بۆ قورئان بۆ هاتنەدی و دروستبوونی ترسان و ملکەچی بۆ خوا، (بە تایبەت لە کاتی باسکردنی سزاو نارەحەتی ئاگری دۆزەخدا).

## ٣٧ له تەواوی بە گەورەگرتنی قورئان خۆسەرقاڵ کردنە بە فێربوون و فێرکردنیەوە

٣٧- عَنْ أَبِي مُوسَى ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعَثَ مُعَاذاً، وَأَبَا مُوسَى إِلَى الْيَمَنِ، «فَأَمَرَهُمَا أَنْ يُعَلِّمَا النَّاسَ الْقُرْآنَ»[1].

واتە: ئەبو مووسا ﵁، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ موعازو ئەبو مووسای نارد بۆ یەمەن، «فەرمانی پێکردن کە خەڵکی فێری قورئان بکەن».

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٩٥٤٤، تعليق شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ حَسَن، رِجَالُهُ ثِقَات، رِجَال الشَّيخَيْن غَيْر طَلْحَة بْن يَحْيَى فَمِنْ رِجَالِ مُسْلِم .



## ❁ مانای زمانەوانی ❁

(بَعَثَ): واتە: ناردی، یان ڕەوانەی کرد.

(يُعَلِّمَا): واتە: لە فێرکردنەوەیە، (علم)یش پێچەوانەی نەزانینە.

## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

• فێربوونی قورئان لەکارە هەرە گرنگ و لە پێشەکانە، چونکە بنچینەی زانستەکان و ناسینی شتەکانە.

• نزیکخستنەوەی فێربوونی قورئان بۆ گشت خەڵکی لە ڕێبازو سوننەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

## ❁ ڕێنماییە کردارییەکان ❁

• فێربوونی قورئان و زانستەکانی قورئان بکە بە کارە هەرە گرنگ و لە پێشەکانی خۆت لە بواری فێربوونی زانستدا.

• قورئان فێربە لە کەسانی تایبەتمەندو شارەزاو کارامە لە قورئان.

# ٣٨ سووربوون لەسەر پابەندبوون بە ڕۆژانە خوێندنی قورئان



٣٨- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ نَامَ عَنْ حِزْبِهِ، أَوْ عَنْ شَيْءٍ مِنْهُ، فَقَرَأَهُ فِيمَا بَيْنَ صَلاَةِ الْفَجْرِ وَصَلاَةِ الظُّهْرِ، كُتِبَ لَهُ كَأَنَّمَا قَرَأَهُ مِنَ اللَّيْلِ»[١].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەس خەوی لێکەوت لەسەر ئەو بەشە قورئانەی شەوان دەیخوێند (پێی تەواو نەکرا)، جا لە نێوان نوێژی بەیانی و نوێژی نیوەڕۆ خوێندی، ئەوە وای بۆ دەنووسرێ وەک لە شەودا خوێندوویەتی».

## ❋ مانای زمانەوانی ❋

(حِزْبِهِ): (حزْب) کۆکردنەوەی شتێکە، هەر لەوەوەیە دەگوترێ: (قَرَأَ حِزْبَهُ مِنَ الْقُرْآن) (واتە: بەشەکەی خۆی، یان کۆمەڵە ئایەتێکی لە قورئان دیاری کردبێ بۆ خوێندنەوە).

---

(١) أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٧٤٧.



## پەیامە پەروەردەییەکان

• لە بە گەورەگرتنی قورئان ئەوەیە پارێزگاری لە خوێندنەوەی چەند ئایەتێکی دیاریکراوی ڕۆژانە بکرێ و، وازی لێ نەهێنرێ.

• خوێندنەوەی قورئان بە شەوو لە کاتی تەنیایی و تاریکایی شەودا لە تەواوی بە مەزنگرتنیەتی.

• لە فەزڵ و چاکەی خوا لەسەر خوێنەری قورئان ئەوەیە: قەزاکردنەوەی ویردی قورئان لە کاتێکی غەیری خۆی هەمان پاداشتی کاتەکەی خۆی بۆ دەنووسرێ (واتە: ئەگەر شەوانە خوێندبێتەوە، شەوێک نەیخوێنێ بیخاتە ڕۆژ، ئەوە پاداشتی ئەوەی بۆ دەنووسرێ کە بەشەو خوێندوویەتی).

## ڕێنماییە کردارییەکان

• سووربە لەسەر ئەوەی ڕۆژانە چەند ئایەتێکی دیاریکراوی قورئانت هەبێ و بیخوێنی.

• با ویردێکی قورئانت هەبێت لە شەودا کاتێک دەبێتە کەشێکی ئارام و جوڵەی شتەکان دەوەستن.

• دەستپێشخەری و پەلە بکە بە گێڕانەوەی ئەو بەشەی قورئان کە لە دەستت چووەو نەتخوێندوە بە هۆی هەر هۆکارێک بێت.

٣٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ لِي النَّبِيُّ ﷺ: «اقْرَأْ عَلَيَّ»، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ آقْرَأُ عَلَيْكَ وَعَلَيْكَ أُنْزِلَ؟ قَالَ: «نَعَمْ»، فَقَرَأْتُ سُورَةَ النِّسَاءِ حَتَّى أَتَيْتُ إِلَى هَذِهِ الْآيَةِ: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾﴾ النِّسَاءِ[1]، قَالَ: «حَسْبُكَ الْآنَ»، فَالْتَفَتُّ إِلَيْهِ، فَإِذَا عَيْنَاهُ تَذْرِفَانِ[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: «قورئانم بەسەردا بخوێنە»، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، من بەسەر تۆدا بخوێنمەوە، کەچی بۆ سەر تۆ دابەزێنراوە؟! فەرمووی: «بەڵێ»، (لە ڕیوایەتی تر فەرموویەتی: پێم خۆشبوو گوێم لێ بێ لە غەیری خۆمەوە) دەڵێ: منیش سوورەتی (النساء)م خوێند، هەتا گەیشتمە ئەم ئایەتە: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾﴾ النِّسَاءِ دەڵێ: فەرمووی: «ئەوەندە بەسە»، جا کە ئاوڕم لێدایەوەو سەیریم کرد، چاوەکانی فرمێسکیان لێ دەهاتنە خوار.

---

(١) ئەمجا (حاڵی کافران) چۆن بێت کاتێک هێنامان لە هەموو ئومەتێکدا شایەتێک (کە پێغەمبەرەکەیانە) تۆیشمان هێنا (ئەی موحەممەد ﷺ) بەشایەت بەسەر ئا ئەوانەوە.

(٢) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٥٠٥٠، ومُسْلِم: ٨٠٠.



## ❁ مـانـای زمانەوانـی ❁

(حَسْبُكَ): واتە: ئەوەندەت بەسە.
(تَذْرِفَان): واتە: (چاوەکانی) فرمێسکیان لێ دەهاتنە خوارەوە.

## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

• گوێگرتن لە قورئان کاریگەری خوێندنەوەی لەسەر دڵ جێدەهێڵێ، هەندێ جار کاریگەری زیاترو پاداشتی گەورەترە لە خوێندنەوەی.

• گرنگیدان بە مورتاح بوونی نەفس لەگەڵ قورئان، ئەویش بە جۆراو جۆرکردنی خوێندنەوەکان و گوێ بۆ گرتنی.

• ڕاوەستان لە کاتی خوێندنەوەی قورئان لە کاتی بوونی بەرژەوەندیەک پێچەوانەی بە گەورەگرتنی قورئان نیە.

## ❁ ڕێنماییە کردارییەکان ❁

• سووربە لەسەر گوێگرتنی قورئان وەک خوێندنەوەکەی، چونکە ئەوە لە سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

• دڵت ئامادە بکە لە کاتی بیستنی قورئان.

• گوێ لە دەنگی ئەم قورئانخوێنە بگرەو هەڵیبژێرە کە کاریگەری لەسەر دڵ و دەروونت دروست دەکات.



٤٠- عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ».

أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٥٠٢٧



واتە: عوسمانی كوڕی عەففان ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «باشترینتان (و گەورەترینتان) ئەو كەسەیە، فێری قورئان دەبێ و، خەڵكیش فێر دەكات».

لە ڕیوایەتی دیكە هاتوە: «إِنَّ أَفْضَلَكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ»[1].

واتە: پایەدارترینتان ئەو كەسەیە، فێری قورئان دەبێ و، خەڵكیش فێر دەكات.

## ❁ مانای زمانەوانی ❁

(**خَيْرُكُمْ**): (خَیـر) پێچەوانەی (شَـرّ)ـە، دەگوترێ: (خَارَ اللَّهُ لَكَ) واتە: خوا ئەو شتەت پێ بدات كە چاكترە بۆت.

(**أَفْضَلُكُمْ**): بە مانای زێدەیی دێت لە شتێكدا، فەزڵیش لەوەوە هاتوە: واتە زیادەو چاكە.

(١) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٥٠٢٨.



## ❁ پەیامە پەروەردەییەکان ❁

• پیاهەڵدان و ستایشکردن لە باشترین ڕێگاکانی ئاڕاستەکردن و پەروەردەکردن و هاندانە لەسەر کردەوە چاکەکان، کە پاڵنان بۆ ئەنجامدانی کردەوە دێنێتە بەرهەم.

• سوودێک کە دەپەڕێتەوە لە زانستەوە بۆ فێرکردنی کەسانی دیکە، لە بەڕێزترینی پێگەکانە، قوڕئانیش بەڕێزترینی زانستەکانە، جا مامۆستای قوڕئانیش دوو سیفەتی بۆ کۆبوونەتەوە، یەکەم: بەڕێزی قوڕئان، دووەم: بەڕێزی فێرکردنەکەی بۆ خەڵک.

• کورتکردنەوە لە دەربڕیندا، لەگەڵ ڕوونی ماناکەی، لە سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خوایە ﷺ، لە کاتی ئاڕاستەکردنەکانی بۆ هاوەڵان.

## ❁ ڕێنماییە کردارییەکان ❁

• فێرکار، یاخود فێرخوازی قوڕئان بە، بۆ گەیشتن و بەدەستهێنانی بەرەکەت و ڕێزو گەورەیی قوڕئان.

• سووربە لەسەر ئەوەی ئاڕاستەکردنەکانت کورت و پوخت بن، وە مانای ڕوون و ڕۆشن و گشتگیریان هەبن.

تەواو بوو

الحَمْدُلِلهِ رَبِّ العَالَمِين



## سوپاس و پێزانین

له کـۆتایی دا دەمەوێ له ناخی دڵمەوە زۆر سوپاسی هەموو ئەو خوشک و برا دڵسۆزو خۆشەویستانەم بکەم، کە بەو پەڕی خۆشحاڵیەوە هاوکاریان کردم لە پێداچوونەوەو هەڵەچنینی ئەم نوسراوەدا، وەهەروەها ئەو خێرخوازو دڵسۆزانەی کە لەڕووی مادديــەوە ئەرکی لەچاپدانیان گرتە ئەستۆ، خوا بە باشترین شێوە پاداشتی هەموویان بداتەوە.

سیروان کاکـه أحمد

دوا پێداچوونەوە

٢٠/٤/٢٠٢١ - ٨/رمضان/١٤٤٢

هەولێر

# نـــــاوەڕۆك

